# قورئان و زانستی سەردەم

نوسینی

د. مۆریس بۆکای

وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە

بوخاری عبدالله قەسری

نالی یوسف خەتەیی





| ناوی کتێب: | قورئان و زانستی سەردەم |
| --- | --- |
| نووسینی | د. مۆریس بۆکای |
| پێداچوونەوەی: | د. بیلال فلیپس (باوکی ئامینە) |
| وەرگێرانی: | بوخاری عبداللە قەسریێ، نالی یوسف خەتەیی |
| نەخشەسازی ناوەوە: | کۆمپیوتەر (محمد علی) |
| نۆرەو ساڵی چاپ: | یەکەم، ٢٠١٣ ز |
| ژمارەی سپاردن: | (١٥٧٨)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە. |

# قورئان و زانستی سەردەم

نوسینی

د. مۆریس بۆکای

وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە

بوخاری عبدالله قەسرێ

نالی یوسف خەتەیی

# پێشەکیی وەرگێڕان

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

لە سەردەمی ئەمڕۆدا، ژیارو بزاڤە شارستانییەکان لەژێر کاریگەری بزوێنەری زانستدا گەشەدەکەن و بەهۆیەوە لە زیندەگیو جوڵەی بەردەوام دان. نەك هەر ئەوەش، بگرە هەر کایەیەکی مرۆیی ئەگەر مۆرکێکی زانستی و پاشخانێکی ئەکادیمی لەپاڵ نەبێت، هەرگیز ڕوەو هەوراز پەرەناسێنێ و هەر زوو دەپوکێتەوە. هەر لەژێر ئەم کاریگەریەو بەهۆی فاکتەرە جیهانگیریەکانی ئەم سەردەمە، زانست جێپەنجەیەکی بەرچاوی لە بزوتنی ژیانی نەتەوەکانی سەر گۆی زەمین دا هەیەو، ڕەوتی کێبڕکێیانەی ژیارییان وەپێش دەخات.

لەپاڵ ئەمەدا..، ئایین بەدرێژایی مێژووی ژیانی مرۆڤایەتی بزوێنەرێکی سەرەکی زۆربەی ڕەوتە ژیاریی و نەتەوەییەکانی گەلانی جیهان بووەو، شکڵ و شێوەی ژیان و هەڵسوکەوتی مرۆڤەکانی نەخشاندووە، هەروەکو دکتۆر هێنری برگسۆن دەڵێ:

(کۆمەڵی مرۆیی بەبێ زانست و هونەرو فەلسەفە ژیاون و دەژین، بەڵام هەرگیز هیچ گروپ و کۆمەڵێك بەبێ بوونی ئایین نەژیاوە).

لەسەر بنەمای ئەم دوو پێوەرە، زاناو بیرمەندە ژیرەکان هەوڵیانداوە ئەو پێکەوە سازان و هاوڕێك بوونەی کە هەیە لەنێوان (ئایین و زانست)دا، وەکو دووانە، بەشێوەیەکی بابەتیانەو لۆژیکیانە بخەنەڕوو، ئەمەش بۆ بەرپەچدانەوەی ئەو بانگەشە بێ بنەمایانەی کە بەم دواییانە بۆ دورخستنەوەی ئایین و زانست لەیەکتری لە ئارادا بوون.

یەکێ لەو هەوڵە ژیرانە، ئەم کتێبە ناوازەی بەردەستتە کە بۆ سەر چەندین زمانی دنیا وەرگێڕدراوە، سوپاس بۆ خوای کارزان توانیمان دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بۆ سەر زمانی کوردیش وەریبگێڕین. ئەم کتێبە بریتیە لە سیمینارێکی پرۆفیسۆر دکتۆر مۆریس بۆکای، کە سەرەتا لە (فەڕەنسا) و دواتر لە (پەیمانگای کۆمۆنوێلس) لە شاری لەندەن پێشکەشی کردووەو، پاشان بە زمانی ئینگلیزی لە ژێر ناوی Quran and Modern Scienc واتە (قورئان و زانستی هاوچەرخ) چاپو بلاو کرایەوە. لەم کتێبەدا

بۆکای باسی چەند ئاماژەیەکی زانستی دەکات لە قورئانی پیرۆزداو لەگەڵ زانستی هاوچەرخ بەراوردیان دەکات، هەروەها باسی گێڕانەوەکانی قورئان و تەورات دەکات بۆ هەندێ ڕوداوی مێژوویی‌و ئەم گێڕانەوانەش لە ژێر ڕۆشنایی زانستی مێژوودا هەڵدەسەنگێنێ‌و بە شێوەیەکی بابەتیانە دەیانخاتە ڕوو. ئەم ڕاستییانەش لەم سەردەمەدا بە گەواهیی گەورە زانایان، بە دیوێکی تری ئیعجازیی قورئان دەخەملێنرێت.

لەڕاستیدا، زانستی ئیعجازی قورئان دوای ئەوە پەیدابوو کاتێ هەندێ لەو موسوڵمانانەی کە سەرەڕای ئاگاداریان لە دەقەکانی قورئان و سوننەت، هەڵسان بە خوێندن و لێکۆڵینەوەی زانستە سروشتیەکان و تاقیکارییەکان، بەمەش زۆر کەڵە زانای موسوڵمان هەڵکەوتن. ئەم زانایانە توانیان پێکەوەسازانێکی سەرسوڕهێنەر لە نێوان ڕاستیە زانستیەکان و ئەو دەقانەی قورئانی پیرۆز بدۆزنەوە کە ئاماژەیەکی زانستی بەخۆوە هەڵدەگرن. دوای ئەوە زۆرێك لە زانا بێ باوەڕەکانی خۆرئاواش هەڵسان بە لێکۆڵینەوە لە قورئانی پیرۆز و بەراورد کردنی لەگەڵ زانستی هاوچەرخ، جا چ بۆ

مەبەستی ڕۆژهەلاتناسی بوبێ یان بە هۆی حەزی فێرخوازییان، یانیش بە هۆی ئەوەی کە گوێبیستی یەکێ لەو ڕاستیانەی قورئانی پیرۆز بووبن و پێیەوە کاریگەر بووبن. زۆربەی ئەو زانایانەش موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاندووە.

بێگومان ئێمە وەك موسوڵمان، قورئانی پیرۆز و ئەو دەقانەی کە تێیدان بە ڕاستیەکی ڕەها دەزانین، ئەو ئاماژە زانستییانەش کە تێیدان بۆ دڵنیا بوونی دڵی ئیماندارانە و بەرەنگاریەکی بێ وەلامیشە بۆ ئەوانەی لافی سەرداریی زانست لێدەدەن بەلام نکوڵی لە ڕاستێتی قورئان دەکەن، ئەمانەو چەندین مەبەستی تریش هەن کە خوای گەورە پێیان ئاگادارە.

لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا، هەوڵماندداوە بەشێوەیەکی ئاسان و پوختو، بە زمانێکی ڕەوان و دوور لە چەمکە قورسەکان، ئەم شاکارەی نووسەر بۆ زمانی کوردی وەربگێڕین، ئەو ئایەتانەشی کە ئاماژەی پێداون ڕاڤەی کوردیمان لە پەراوێزدا بۆ نوسیوەو بۆ ئەم مەبەستەش سوودمان لە تەفسیری "ئاسان" وەرگرتووە. هەروەها لەپەراوێزدا ئەو زانیاری و ڕونکردنەوانەمان زیاد کردووە کە خوێنەر

بۆ حاڵی بوونی دەقەکە پێویستی پێیەتی، وشەی (وەرگێڕ) یشمان کردۆتە هێما بۆ جیاکردنەوەی لە وتەکانی نوسەر.

ئیدی ئومێدەوارین کە وەرگێڕانی ئەم کتێبە خزمەتێکی بچوک بە تێگەیشتنی سەردەمیانەی قورئان بکات لە کۆمەڵگای کوردی و، لەسەرووی هەموشیەوە ڕەزامەندی خوای مەزن وەدەست بهێنین.

وەرگێڕان

بوخاری و نالی

٢٠١٢\٩\١١ز، هەولێر

## مۆریس بۆکای

زانای فەڕەنسی (مۆریس بۆکای) لە ١٩ ی تەموزی سالّی ١٩٢٠ز لە (پۆنت لو ڤێك) لە فەڕەنسا لە دایك بووە. سەرەتا لە قوتابخانە مەسیحیە کاسۆلیکیەکاندا خوێندویەتی و پاشان چووەتە پاریس و لە زانکۆی پاریس لە کۆلێژی "لی کۆل دو میدیسین" دەستی بە خوێندنی زانستی پزیشکی کردووە. لە سالّی ١٩٤٥ز وەك پسپۆرێکی تازەی گەدەو ڕیخۆڵە لە کلینیکی زانکۆ دەستی بە کارکردن کردووە. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٤٥ز تاوەکو ١٩٨٢ بە کاری پزیشکیەوە سەرقاڵ بووەو لەو ماوەیەدا دکتۆری خانەوادەی شا فەیصەڵ بووە لە سعودیەو، یەکێکیش بووە لە دکتۆرەکانی خانەوادەی ئەنوەر ساداتی سەرۆکی ئەوسای میسر.

بۆکای هەمیشە پشتی بە زانیاریە چڕو پڕەکەی دەبەست لە دەقە ئینجیلیەکان و هەروەها حەزێکی لە ئەندازەبەدەریشی هەبوو بۆ میسرناسی (Egyptology)، ئەوەبوو پەیوەندی بە ڕێکخراوی فەڕەنسی میسرناسیی کرد (ئەم ڕێکخراوە لە سالّی ١٩٢٣ی زایینی لە پاریس دامەزراوە)، کە لەوێدا فێری زمانی هیرۆگلیفی بوو، ئەمانە دوو فاکتەری سەرەکی بوون بۆ ئەو ڕوداوەی کە بووە هۆی گۆڕانی سەراپای ژیانی. بۆکای لەسالّی ١٩٦٩ پەیوەندی بە زانکۆی

سۆربۆنەوە کرد و لە کۆلێژی زمانە خۆرهەلاتیەکان دەستی بە خوێندنی زمانی عەرەبی کرد، ئەمەش دوای ئەوەی هەستی بەو راستیە کرد کە بۆ ئەوەی بتوانێ لێکۆڵینەوە لە قورئان بکات پێویستە زمانی عەرەبی بە باشی فێربێت، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٧٢ی زایینی خوێندنی زمانی عەرەبی تەواو کرد و بە ئاستێکی بەرز فێری عەرەبی بوو. دوای ئەوەی بۆکای پەی بە بوونی راستێتی و رەسەنایەتی قورئانی پیرۆز برد، ئیتر لە نیوەی یەکەمی هەشتاکان بە دواوە زیاتر خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لە قورئانی پیرۆز و بەراوردکردنی بە زانستی هاوچەرخ، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٨٢ زایینی دەرگای نۆرینگەکەی داخست و خۆی بۆ لێکۆڵینەوە تەرخانکرد. مۆریس بۆکای لە ١٧ ی شوباتی ساڵی ١٩٩٨دا کۆچی دوایی کرد و بە ئاخیر خێریەوە بەرەو لای خوای گەورە گەڕایەوە.

*** ئەو خەلاتانەی کە دکتۆر مۆریس بۆکای بە دەستی هێناون:**

١- لە ساڵی ١٩٩٨ خەلاتی مێژوو لە ئەکادیمیای فەرەنسی.

٢- خەڵاتی ئەکادیمیای نیشتیمانی پزیشکی فەرەنسی.

**بەرهەمەکانی مۆریس بۆکای:**

١- *La Bible, le Coran et la Science Les Écritures Saintes examinées à la lumière des connaissances modernes,* ١٩٧٦ (کتێبی پیرۆزو قورئان و زانست ... لێکۆڵینەوە لە دەقە پیرۆزەکان لە ژێر ڕۆشنایی زانستدا)

٢- Mummies of the Pharaohs -١٩٩٠ St. Martin's Press, (مۆمیاکانی فیرعەونەکان)

٣- The Quran and modern science (قورئان و زانستی هاوچەرخ)

٤- ٢٠٠٥ *What is the Origin of Man?* (بنچینەی مرۆڤ چیە؟)

٥- ١٩٩٥ *Moïse et Pharaon ; Les Hébreux en Egypte* (موساو فیرعەون، عیبرانیەکانی میسڕ)

٦- ١٩٨٩ *Réflexions sur le Coran* (ڕازەکان لەبارەی قورئان).

## لە وتەکانی مۆریس بۆکای:

١- "هەرگیز دەرکم بە ڕێککەوتن و پێکەوەسازانی ئایین و زانست نەکردبوو، تا ئەو کاتەی دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە لە قورئانی پیرۆز. لە ئیسلامدا ئایین و زانست وەك دوو برای جمك وان، چونکە قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمان دەدەن بە هەموو موسوڵمانان کە داوای زانست بکەن. بێگومان هەموو ئەو دەستکەوتە گەورانەی شارستانیەتی ئیسلامی بۆ پابەند بوونی موسوڵمانان دەگەڕێتەوە بەو شتانەی کە لەسەریان پێویست کراوە".

٢- "یەکەم شت کە مرۆڤ توشی سەرسوڕمان دەکات کاتێ کە یەکەم جار ڕوبەڕوی قورئان دەبێتەوە بوونی ئەو هەموو زانیاریە زۆر و زەوەندە زانستیانەیە کە هەموویان بە پێی زانستی تاقیکاری ئەمڕۆ ڕاست و دروستن، لە کاتێکدا ئەو تەوڕاتەی ئێستا لەبەر دەستدایە، هەڵەی زانستی گەورەی تێدا بەدی دەکرێت".

٣- "ئەگەر نوسەری قورئان مرۆڤ بوایە چۆن توانیویەتی لە سەدەی حەوتەم ڕاستی زانستی وا بنوسێ، کە بە هیچ شێوەیەك ناچنەوە سەر ئەو زانیاریە هەڵانەی ئەو کاتە باوو بوون".

## مسوڵمان بوونی موریس بۆکای

فەرەنسا یەکێکە لەو وڵاتانەی کە زۆرترین گرنگی بە بواری شوێنەوارناسی دەدات لە لەسەر ئاستی جیهان. دوای دەست بەکاربوونی (فرانسۆ میتران) وەك سەرۆکی فەرەنسا بە شێوەیەکی ڕەسمی لە ساڵی ١٩٨١ ز داوای لە وڵاتی میسر کرد کە تەرمی فیرعەون بنێرنە فەرەنسا بۆ ئەوەی شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی شوێنەوارناسی و زانستیی لەسەر بکەن. ئەوەبوو تەرمی فیرعەون بە فڕۆکەیەك نێردرایە فەرەنساو لە کاتی گەیشتنی دا سەرۆکی وڵات و وەزیرەکان و گەورە بەرپرسەکان لە فڕۆکەخانە ئامادەبوون‌و پێشوازیەکی شاهانەیان لە فیرعەون کرد، وەك بڵێی فیرعەون هێشتا لە ژیاندایە! . دوای پێشوازی لێ کردنی لە فڕۆکەخانە، بەو پەڕی ڕێزگرتنەوە ناردیانە سەنتەری شوێنەوارناسی فەرەنسی، تاوەکو گەورەترین زانایانی بواری شوێنەوارناسی و زاناترین پزیشکانی بواری نەشتەرگەری و توێکاری لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن. سەرۆکی دەستەی لێکۆڵینەوەکە و بەرپرسی یەکەمی لێکۆڵینەوە لە تەرمی فیرعەن پرۆفیسۆر دکتۆر مۆریس بۆکای بوو. لە کاتێکدا لێکۆڵەرەوەکان خەریکی ڕێکخستنەوەو چاککردنەوەی مۆمیاکە بوون، کەچی سەرۆکەکەیان

(د. مۆریس بۆکای) بە شتێکی ترەوە سەرقاڵ بوو! ئەویش ئەوەبوو کە ئایا ئەو پاشایە بەچی مردووە؟. ئەوەبوو لە درەنگانێکی شەودا ئەنجامە کۆتاییەکان دەرکەوتن.

ئەنجامەکە وای دەرخست کە هۆکاری مردنی ئەم فیرعەونە بریتیە لە نقومبوونی لە ئاودا, دیارترین بەڵگەش لەسەر ئەمە بریتی بوو لە بوونی خوێ لە ناو تەرمەکەیدا. بەڵام مۆریس بۆکای زیاتر سەرسام بوو کاتێ بیری لەوە کردەوە کە ئایا هۆکاری ئەوە چیە کە لە ناو ئەو هەموو تەرمە مۆمیاکراوانەدا ئەم تەرمە ئاوا بە سەلامەتی ماوەتەوە لە کاتێکدا ئەمەیان لە ئاودا خنکاوەو لە دەریا دەرهێنراوە ئینجا مۆمیا کراوە. مۆریس بۆکای سەرقاڵی ئامادەکردنی راپۆرتی کۆتایی بوو کە پێی وابوو شتێکی نوێی دۆزیوەتەوە، ئەویش بریتیبو لەوەی کە فیرعەون لە ئاودا نقوم بووەو دواتر یەکسەر دەرهێنراوەو مۆمیا کراوە. لەم سەرو بەندەدا یەکێك بە گوێیدا چرپاند و پێی گوت کە پەلە نەکات لە راپۆرتەکەی، چونکە موسوڵمانەکانیش باسی نقوم بوون و بەسەلامەتی مانەوەی ئەم لاشەیە دەکەن. بەڵام مۆریس بۆکای ئەم هەواڵەی زۆر بە توندی رەت کردەوەو، گوتی زانیاریەکی وا تەنها

لە ڕێگای زانستی نوێوە دەردەکەوێ، ئەویش بە هۆی لێکدانەوە کۆمپیوتەریە وردەکان. بەڵام هاوڕێکەی پێی ڕاگەیاند کە ئەو قورئانەی موسوڵمانان بڕوایان پێیەتی چیڕۆکی نقومبوونی ئەم فیرعەونە دەگێڕێتەوەو ئامارژەش بە هێشتنەوەی تەرمەکەی دەکات بە سەلامەتی. مۆریس بۆکای بەمە زۆر سەرسام بوو، لە خۆی پرسی، ئایا چۆن دەکرێ قورئانێك کە زیاتر لە هەزار و چوارسەد ساڵ تەمەنیەتی باسی ئەم ڕاستیە بکات کەچی تا ساڵی ١٨٩٨ زایینی هیچ کەسێك بەم تەرمەی نەدەزانی؟، بەڵکو تا ئەم ڕۆژانەی دوایی کەس نەیدەزانی (مۆمیا) بوونیشی هەیە؟.

مۆریس بۆکای بەو پەڕی سەرسامیەوە لە بەردەم تەرمەکە دانیشت و هەر بیری لەو قسەیەی هاوڕێکەی دەکردەوە کە قورئان باسی مانەوەی ئەو تەرمە دەکات بە سەلامەتی، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەگەرچی ئینجیلی و لۆقا و مەتتا باسی ئەوە دەکەن کە فیرعەون لە کاتی بەدواکەوتنی موسا (درودی خوای لەسەربێ) لە ئاودا نقوم بووە، بەڵام هیچ ئامارژە بە چارەنوسی تەرمەکە ناکەن. بە سەرسوڕمانیەوە لەخۆی دەپرسی ئایا دەگونجێ ئەم مۆمیایەی

بەردەمم ئەو فیرعەونە بیّ کە دوای موسا (درودی خوای لەسەربیّ) کەوتووە؟ ئایا دەگونجیّ موحەممەد (درودی خوای لەسەربیّ) پێش هەزار سالّ ئەمەی زانیبیّ، کەچی من تازە بۆم دەردەکەویّ؟!

ئەو شەوە مۆریس بۆکای نەیتوانی بخەویّ، داوای کرد کە تەوراتی بۆ بێنن. دەستی کرد بە خوێندنەوەی سفری دەرچوون (Exodus): "ئاوەکە گەڕایەوەو، سوار و عارەبانەو هەموو ئەو سوپایەی فیرعەونی داپۆشی کە بەدوای موسادا چوونە ناو دەریاو، تەنانەت یەك کەسیشیان لیّ دەرنەچوو"، دوای خوێندنەوەی تەوراتیش مۆریس بۆکای هەر بە سەرسامی مایەوە چونکە، لەوێشدا مانەوەی تەرمی فیرعەون بە سەلامەتی، باسی نەکرابوو.

فەرەنسا دوای ئەوەی کە گوایە لێکۆڵینەوەی تەواوی لەسەر ئەو تەرمەو لەسەر مۆمیاکەی کردووە تەرمەکەی بە بەرگێکی شوشەی گرانبەها داپۆشی و، بە فەرمی ناردیەوە میسر. بەلاّم مۆریس بۆکای نە بڕیاری کۆتایی داو نە بیر و خەیاڵیشی ئاسودە بوو. دواتر خۆی کۆکردەوەو بەرەو ولاّتی سعودیە بەڕێکەوت تاوەکو بەشداری کۆنگرەیەك بکات کە پزیشکە موسوڵمانەکانی بواری توێکاری تێیدا

بەشدار بوون. ئەوەبوو هەر کە دەستی بە قسەکردن کردو ئەو شتەی خستەڕوو کە دۆزیویەتیەوە لەبارەی نقومبوونی فیرعەون لە ئاوداو مۆمیاکردنی، دکتۆرێکی موسوڵمان هەڵسایەوەو قورئانی پیرۆزی کردەوەو دەستی کرد بە خوێندنەوەی وتەکانی خوای گەورە (سبحانه و تعالی) ﴿فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾ ﴿يونس: ٩٢﴾[١] . ئەم ئایەتە پیرۆزە زۆر بە توندی کاری تێکرد، بە شێوەیەك کە بە هەموو توانای خۆی وتی: "ئەوە من هاتمە ناو ئیسلام و بڕواشم بەم قورئانە هێنا".

دوای ئەوە، مۆریس بۆکای گەڕایەوە فەڕەنسا بەڵام بە ڕویەکی تر، بە بیرو باوەڕێکی تر و بە دڵێکی تر و، یەکسەر دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لە قورئان و کتێبی پیرۆز لە ژێر ڕۆشنایی زانست

---

[١] ﴿ئەمڕۆ ئیتر لاشەی تۆ ڕزگار دەکەین تا ببێتە موعجیزەو پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای تۆ دێن (دیارە خوای گەورە پاراستویەتی لەوەی کە ماسی بیخوات، شەپۆلی دەریا گەیاندیە کەنار، تا ئەوانەی کە بەخوایان دەزانی بەچاوی خۆیان ببینن کە فیرعەون ئادەمیزادێکە وەك ئەو خەڵکەو ببێتە پەند، بۆ هەموو پاشاو زۆردارەکانی سەر زەوی کە ئەوە سەرەنجامی مسۆگەری هەموویانە)، بەڵام بەڕاستی زۆربەی خەڵکی لە ئایەت و موعجیزەکانی ئێمە غافڵ و بێ ئاگان﴾.

بۆئەوەی ئەگەر هەر تێکگیرانێك یان نەگونجانێك یان هەمامەنگیەك هەبێ لە نێوان ئەم دەقە ئایینیانەو زانستی هاوچەرخ بیدۆزێتەوە.

یەکێك لە بەرهەمەکانی بۆکای بریتیە لە کتێبێك بە ناوی (کتێبی پیرۆزو قورئان و زانست ... لێکۆڵینەوە لە دەقە پیرۆزەکان لە ژێر ڕۆشنایی زانست) کە بریتییە لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە ماوەی دە ساڵ ئەنجامی دابوون. بەڵام چ ئەنجامێك؟ ئەنجامێك کە بۆ خۆی و بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەرخست کە ئینجیل و تەورات ئەگەر ئاماژەیەکی زانستی یان مێژویی تێدابێ ئەوا کرچ و کاڵەو تەنانەت لەگەڵ عەقڵیشدا ناگونجێ چ جای لە ڕوی زانستیەوە لێکی بدەینەوە، بەڵکو تەنها بریتیە لە خوراڧەو ئەو بیرو باوەڕە کرچ و بێ بنەمایانەی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەورەپادا باو بوون، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەم کتێبانە لە لایەن مرۆڤەوە دەستکاری کراون و پڕ کراون لە قسەو گوفتاری بێ بنچینە، لە بەرامبەریشدا، لەو ماوە دورو درێژەی لێکۆڵینەوەیدا مۆریس بۆکای نەیتوانی هیچ تێکگیرانێك بدۆزێتەوە لە نێوان زانست و قورئانی پیرۆز سەرەڕای ئەو هەموو ئاماژە زانستی و مێژوییانەی کە قورئان

لەخۆی گرتوون. هەر مرۆڤێك ئەو کتێبە بخوێنێتـەوە کـە بەرهـەمی لێکۆڵەرەوەیەکی زانایانەو و بابەتیانەیە، هەست بـە گـەورەیی ئـەو قورئانـە دەکـات و سـەری لـەم پارچـە موعجیزەیـە سورِ دەمێنـێ. بێگومان ئەمەش شتێکی ئاسابیە چونکە قورئـانی پـیرۆز کتێـب و فەرمودەی خوای گەورەیە (سبحانه و تعـالی). مۆریس بۆکـای ئـەم کتێبەی بە زمانی فەرەنسی نوسیوە، بەڵام هەر لە گەڵ چاپکرانیدا بـە پەرتوکخانـەکانی جیهانـدا بڵاوبویـەوەو، بـۆ زۆریـەی زمانـەکانی وڵاتـە ئیـسلامیەکان وەرگێـردرا لەوانـە عـەرەبی و فارسـی و ئیندۆنیـسی و تـورکی و ئـۆردۆ و هینـدی و مـەلاوی، هـەروەها بـۆ هەنـدێ لـە زمانـە ڕۆژئاواییـەکانیش وەرگێـردرا لەوانـە ئینگلیـزی و ئەڵمانی و بۆسنی و هی تریش. ئەم کتێبـە لـە چاپەکانی دواتـر بـە سـەدان هـەزار دانـەی لێ چاپکرا و بـە ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاوادا بـڵاو بویەوە. ئەگەرچی زۆر لە زانا بێ بڕواکان هەوڵی وەلامدانەوەی ئـەو کتێبەیان دا بەڵام کەس نـەیتوانی شـتێکی ئـەوتۆ پێشکەش بکـات جگە لە جـەدەل و قـسەی بـێ بەڵگـە، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی کـە هەندێ لەو زانا بێ باوەڕانە لـە دوای خوێندنـەوەو لێکۆڵینـەوە لـەم کتێبـە بـە مەبەسـتی وەلامدانـەوەی و بـە درۆخـستنەوەی، جگـە

لەوەی کە بە هیچ شێوەیەك نەیانتوانی وەڵامی بدەنەوە بەڵکو ئەوەندە پێی کاریگەربوون کە موسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند.

## بۆكاليزم

ئەم زاراوەیە لە لایەن ئەكادیمیەكانەوە بەكاردێ بۆ ئامـاژەكردن بەو جولآنەوەیەی كە زانست و ئاین بەیەك دەبەستنەوە بە تایبـەتی ئاینی ئیسلام.

ئەمەش دوای ئەوە هات كە مـۆریس بۆكـای هەڵسا بـەم كـارە و بەو بیرو ڕایانەی مۆریس بۆكای گوترا، كە پێی وایە قورئان وەسفی هەندێ دیاردەی زانستی دەكات زۆر پـێش ئـەوەی زاناكـانی ئـەمڕۆ دوبارە بیدۆزنەوە. شایانی ئامآژە پێدانـە ئـەم ڕایانـە كاریگەریـەكی گەورەیان لەسەر زانایانی ڕۆژئاوا دروست كردووەو بوونەتە جێگـای گفتوگۆو مشتومڕ لە نێو زانایانی ڕۆژئاوادا.[٢]

---

٢ بۆ نوسینی ژیان و موسوڵمانبوونی مۆریس بۆكای سوودمان لە ئەنتەرنێت وەرگرتووە: http://www.inspiringislam.net/٢٠١١/٠٢/dr-maurice-bucaille-convert-story.html (وەرگێڕ)

# پێشدەستیی

ئەم نامیلکەیەی دکتۆر مۆریس بۆکای بەدرێژایی نۆزدە ساڵی ڕابردوو لێرەو لەوێ بەکارهێنراوە، ئامرازێکی زۆر کاریگەرو سودبەخش بووە بۆ ناساندنی ئیسلام بە بێباوەڕان و، هەروەها هۆکارێکی بەرچاویش بووە بۆ شارەزاکردنی مسوڵمانان بە لایەنە زانستی یە ئیعجازییەکانی قورئانی پیرۆز. ئەم نامیلکەیە لەئەسڵدا بریتی یە لە خستنە سەرکاغەزی وانەیەکی دکتۆر مۆریس بۆکای کە لە فەڕەنسا پێشکەشی کردبوو.

لەم چاپەدا، بڕیارمدا شێوازی خستنەڕووی نامیلکەکە پەرە پێبدەم بە ساناکردنی زمانەکەو گۆڕینی شێوازی گوفتەیی بۆ شێوازی دەستنووس، ئەمە جگە لەوەی کە لە هەندێ شوێنان کە پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاتر هەبووە، هەندێ تێبینیمان لە کتێبی (کتێبی پیرۆز و قورئان و زانست) کە هی نوسەر خۆیەتی زیادکردوون، هەربۆیە ئەو ئازادییەم دەستەبەر کرد کە بتوانم ناوە ناوە هەندێ شت لەو کتێبەی ئەو دەرهێنم و لێرە لەوشوێنانەی کە پێویستییان بە ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە زیادی بکەم. ئەمە لەپاڵ زیادکردنی هەندێ کورتە تێبینی و جێگۆڕکێ کردن بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر کە نووسەر هێنابووی بەلاّم ڕیوایەتەکەی

تەواو نەبوو..، ئینجا هەندێ لەو بابەتە مێژووییانەی کە نوسەر لەبارەی کۆکردنەوەی قورئانەوە باسی کردبوون ڕاستکراونەتەوە.

ئومێدم وایە کە ئەم وردە دەستکارییانە بوبێتنە هۆی بەکاریگەرتر بوونی ئەم شاکارەی نووسەر لەپێناوی خستنەڕووی کۆتا پەیامی خوای گەورە بۆ مرۆڤایەتی.

دکتۆر بیلال فلیپس (باوکی ئامینە)[٣]

بەڕێوەبەری سەنتەری زانیاری ئیسلامی دوبەی

شانشینی ئیماراتی عەرەبی

مایسی ١٩٩٥

---

٣ دکتۆر بیلال فلیپس لە جامایکا لە دایك بووەو لە کەنەدا گەورە بووە، لە ساڵی ١٩٧٢ز موسوڵمان بووە. لە کەنەدا و سعودیە و بەریتانیا خوێندویەتی تاوەکو دکتۆرای لە هزری ئیسلامی بەدەست هێناوەو، شارەزایە لە بواری پەروەردەو لاهوت و بنەماکانی ئاین و زمانی عەرەبی. تا ئێستا چەندین دەزگا و سەنتەری ئیسلامی دامەزراندووە، هەروەها خاوەنی چەند کتێبێکەو، هەڵساوە بە پێداچونەوەی چەندین کتێبی بەناوبانگ (وەرگێڕ) .

# پێشەکی

لــە ٩ی نۆڤەمبــەری ســاڵی ١٩٧٦ز وانەیــەکی دەرئاســام لــە ئــەکادیمیای پزیـشکی فەرەنـسی پێـشکەشکرد لــەژێر ناونیـشانی "زانیارییــە کارئەنـدامزانی و کۆرپەلەزانییــەکانی قورئــان"، مــن بــە پشت بەستن بە هەبوونی چەندین دەقی دیاریکراو لە قورئانی پیرۆز لەبارەی کارئەنـدامزانی و زۆربوونـەوە هەڵـسام بـە پێـشکەشکردنی ئەو توێژینەوەیە، بەو مەبەستەی کـە ئـەوە دەرخـەم کـە ئەستەمە دەقێك لەسەدەی حەفـدەی زاییـنی لەلایـەن مرۆڤـەوە داڕێـژدرابێت لەکاتێکدا کە چـەندین ڕاسـتی تێدایە کـە تـەنها لەچـەرخی نـوێ دا دۆزراوەتەوە.

کاتێك کە بۆ یەکەمجار لەبارەی کۆمەڵێ بابەتی پزیشکی وتوێژم لەگەڵ ئەندامانی کۆمـەڵگای پزیـشکان دەکـرد، بـۆم دەرکـەوت کـە دەتـوانم زۆر بــە ئاســانی چـەندین ڕاسـتیی زانـستی لـە دەقــەکانی قورئانـدا نیـشان بـدەم نـەك هـەر لەگـەڵ پزیـشکاندا بـەڵکو لەگـەڵ هەرکەسێکدا کە پسپۆڕی لە لقێکـی تـری زانـستدا هـەبێت: هـەر لـە گەردووننـاســـان و ئاژەڵناســـان و زەویناســـان و، ئەوانـــەی کـــە پسپۆڕییان هەیـە لـە تەمـەنی زەوی و...هتـد، هـەموویان بەوێنـەی پزیشکان توشی سەرسام بـوون دێـن لـەوەی کـە لەقورئانـدا هەیـە

کاتێك کە تێبینی ئەوە دەکەن کە قورئان چەندە بە وردی دیاردە سروشتییەکانی ڕاڤەکردووە.

کاتێك کە لەو دەرخستنە زانستییانەی قورئان ڕادەمێنین و ڕەچاوی مێژووی پێشکەوتنی زانست دەکەین، توشی سەرسوڕمان دێین و دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەو ڕاستییە قورئانیانە بەرەنگاریی زانستی مرۆڤەکان دەکەن.

هیچ بەرهەمێکی مرۆڤ بوونی لەئارادا نییە کە وەکو قورئان خاوەنی کۆمەڵێك وتە بێت کە دەرئاسایە لە زانستی ڕۆژگاری خۆی! ئەمڕۆ جێی خۆیەتی چەندان ڕاستی زانستیی هاوچەرخ لەگەڵ دەقە قورئانییەکاندا بەراورد بکرێن، هەرچەندە لەو ڕاڤانەی کە بە زمانە ئەوروپییەکان بۆ قورئان کراون، جگە لە چەند ئاماژەیەکی ناڕوون و پچڕ پچڕ هیچ شتێکی ئەوتۆیان لە ڕاستییە زانستی یەکانی قورئان ئاماژە پێ نەکردووە، ڕاڤە عەرەبییەکانی قورئانیش نەیانتوانیوە توێژینەوەیەکی سەرتاسەریی لەبارەی بابەتە زانستییەکانی قورئان بخەنە بەردەست، هەربۆیەش ناچاربووم توێژینەوەیەکی سەراپاو هەمەلایەن بۆ ئەم مەبەستە بکەم.

سەرەڕای ئەمەش، وای دەخواست کە توێژینەوەیەکی بەراوردکاری بکەم لەنێوان زانیاریەکانی "کتێبی پیرۆز" -تەورات و ئینجیل، بۆیە لەم پرۆژەیەدا بەراوردکارییەك کراوە لەنێوان هەر دەقێکی کتێبە ئایینی یە ئاسمانیەکان لەگەڵ داتا زانستیی یەکاندا. لە کۆتاییشدا ئەم توێژینەوەیەمان کتێبێکی لێ بەرهەم هات بەناونیشانی (کتێبی پیرۆز و قورئان و زانست)، یەکەم چاپی فەرەنسیشی لە ئایاری ١٩٧٦ دەرکەوت، دواتریش چاپە ئینگلیزیو عەرەبیەکەشی بلاّوکراونەتەوە.

## ئایین و زانست

ڕەنگە ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر موحەممەد کە زۆر هێنراون و باسکراون باشترین شت بن بۆ دەرخستنی ئەو پێکەوە پەیوەستبوونە نزیکەی لەنێوان ئیسلام و زانستدا هەیە، وەکو پێغەمبەر (درودی خوای لێبێ) دەفەرموێت: "داواکردنی زانست پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێك"[٤]، "دانایی بزربووی مرۆڤی بڕوادارە"[٥]، "هەرکەسێ ڕێگایەك بگرێتەبەر بۆ دەستخستنی زانست ئەوا خوا ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات"[٦].

ئەم فەرموودانەو چەندانی هاوشێوە، داوای ڕاست و ڕەواو بەجێن بۆ مرۆڤایەتی تاوەکو زانیاریەکانیان بە سەرچاوەی جۆراوجۆری وەرگرتنی زانست و بەدواداگەڕانی دەوڵەمەند بکەن. لەبەرئەوە جێی سەرسوڕمان نییە ئەگەر بڵێین لە ئیسلامدا ئایین و زانست هەمیشە وەکو دوو خوشکی دوانە وان، لە چەرخی ئەمڕۆشدا کە زانست ئەوپەڕی هەنگاوی گەورەی بەرەوپێشەوە ناوە، ئایین و زانست بۆ هەمیشە پێکەوە دەستلەملان دەبن.

---

٤ (طلب العلم فريضة على كل مسلم) ئیبن ماجە گێڕاویەتیەوە.

٥ (الحكمة ضالة المؤمن) توورمزی و ئیبن ماجە گێڕاویانەتەوە.

٦ (من سلك طريقا يلتمس فيه علما سهل الله له طريقا الى الجنة) موسلیم گێڕاویەتیەوە.

جێگای سەرسوڕمانیش نییە بزانین کە هەندێ ڕاستیی زانستی وامان لێدەکەن باشتر لەقورئان حالّی ببین، جگە لەمەش لە چەرخێکدا کە زۆرێك لە خەڵکی پێیان وایە کە ئیدی زانست ئایین و بڕوای خستۆتە چالّی مەرگەوە، کەچی ئەوە دۆزینەوە زانستییەکانن کە دەرئاسایی وەحی و ڕەسەنایەتی ئایین و ڕێنماییەکانی دەردەخەن، ئەمەش بە لێکۆڵینەوەی دەقە ئیسلامیەکان لەژێر نەشتەری تاقیکردنەوەی بابەتیی دا.

دوای هەموو ئەو شتانە، بە پێچەوانەی بیروڕاو گوتەی زۆرکەس، زانست ئاوێنەیە بۆ ڕەنگدانەوەی بوونی خوا. کاتێك ویستمان دوور لە دەمارگیری و توندڕەوی، ئامۆژە میتافیزیکییەکان لە زانستی ئەمڕۆ دوور بخەینەوە: بۆنمونە ئەگەر پرسیار بکەین لەبارەی پێکهێنەرە بچوکەکانی ماددە یان چۆنیەتی پەیدابوونی ژیان لە ماددەی نا زیندووەوە ئەوا بەدڵنیاییەوە زۆر هۆکار ناچارمان دەکەن بیر لە خوا بکەینەوە، یان کاتێك کە بیر لەو هەموو ڕێککاری‌و وردەکارییە دەکەینەوە کە باڵی کێشاوە بەسەر لەدایکبوون و سەرهەڵدانی ژیانەوە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەگەری پەیدابوونی ژیان لە ڕێکەوتەوە زۆر بە ئاشکرایی بە ئەرزدا ڕۆدەچێت و لەبەین دەچێت.

جا هەتاکو زیاتر زانیاریمان دەربارەی زانست بەهەموو بوارە جۆراوجۆرەکانیەوە بەرەوپێش بچێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە هەندێك چەمك بەرەو نەمان دەچن و بڕواکردنیان ئەستەم دەبێت، بۆنمونە: براوەی ئەم دواییەی خەڵاتی نۆبڵ لەبواری پزیشکی کە زانایەکی فەرەنسی بوو بیرۆکەیەکی ورووژاند بەوەی کە ماددەی زیندوو لەخۆیەوە لە پێکهاتەی کیمیایی سادەوە وەدیهاتووە لە ئەنجامی ڕێکەوت و چەند بارودۆخێکی تایبەتەوە، پاشان لەمەوە بانگەشەی ئەوە کرا کە ئەندامی زیندووش هەمان حاڵەتی هەیەو، وردە وردە بەرەو ئاڵۆزی و پەرەسەندن دەڕوات، تاکو دەبێتە ئەو زیندەوەرەی کە پێی دەڵێن (مرۆڤ).

من پێم وایە کە پێشکەوتنە زانستی یەکان بەڵگەگەلێکی بەهێزتر دژ بەم بیردۆزە دەخەنە بەردەست لەبارەی ئاڵۆزی و سەرسوڕهێنەریی زیندەوەرە باڵاکانەوە، چونکە ئەو هەموو ڕێك و پێکی و جوانکارییە دەرئاسایەی کە دەستی بەسەر تێکڕای دیاردەکانی ژیانەوە گرتووە ناچارمان دەکەن دان بە بوونی وەدیهێنەرێکدا بنێین.

لە زۆر شوێنان قورئانی پیرۆز بە گشتی پەردە لە سەر ئەو ڕاستییانە هەڵدەماڵێت و دەیانخاتە ڕوو، هەروەها زانیاریگەلێکی

وردی یەکجار زۆریش لە قورئاندا هەن ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بەو ڕاستییانەوە هەیە کە لەلایەن زانستی هاوچەرخ دۆزراوەتەوە، ئەمەش سەرنجی زاناکانی ئەمڕۆی بەلای خۆیەوە ڕاکێشاوەو سەرسامی کردوون.

## قورئان و زانست

بەدرێژایی چەندین سەدە، مرۆڤ نەیدەتوانی لە کۆمەڵێك زانیاری حاڵی بێت کە لە ئایەتەکانی قورئاندا هەن چونکە ئامرازی زانستی ئەوتۆیان لەژێر دەستدا نەبوو، بەڵام ئەمڕۆ دەتوانین پەی بە مانای چەندەها ئایەتی قورئان ببەین کە پەیوەندییان بە دیاردە سروشتییەکانەوە هەیە. ئەگەر چاوێك بخشێنین بەو تەفسیرە کۆنانەی کە بۆ قورئان کراون، لەگەڵ ئەوپەڕی زانایی ڕاڤەوانەکانیشدا، ئەوا دەبینین کە ئەو ڕاڤە قورئانیانە گەواهی ئەوە دەدەن کە ئەو ئایەتانە مانایان ئەوەندە قوڵ بووە کە بونەتە بەربەست لەبەردەم تێگەیشتن و ڕاڤەکردنیان دا. تەنانەت دەتوانم بڵێم لەسەدەی بیستەمیشدا بەو هەموو زانستە پەرش و بڵاوو فرەلایەنە پێشکەوتووەشەوە، هێشتا بۆ زانایەکی ئاسایی ئەوەندە ئاسان نییە، بەبێ گەڕانەوە بۆ توێژینەوەکان لە پسپۆڕیی تایبەتدا، لەو هەموو شتانە حاڵیی بێت کە لە قورئاندا دەیخوێنێتەوە! ئەمە مانای ئەوەیە کە بۆ ئەوەی هەرکەسێك لە تێکڕای ئەو ئایەتانەی قورئان حاڵی بێت، پێویستە زانستێکی ئینسایکلۆپیدیایی هەبێت کە چەندین بەندو لقی زانستی لەخۆ بگرێت.

دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوەش بکەمەوە کاتێ وشەی (زانست) بەکاردەهێنم، مەبەستم پێی بریتی یە لەو زانیاریەی کە لەسەر

بنەمایەکی بەهێزو پتەو دامەزراوە نەك تیۆرگەلێك کە تەنها بۆ ماوەیەکی کاتی سودبەخشن لە لێکدانەوەی دیاردەیەك یان کۆمەڵێك دیاردەدا، دواتریش مشتومڕی تر لەخۆ بگرن! چونکە لێکدانەوە نوێیەکان بڕوا پێکراوترن و زیاتر لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی دا دەگونجێن. هەربۆیەش من تەنها ئەو ڕاستییە زانستییانەم لەگەڵ ئایەتە قورئانی یەکاندا بەراود کردوون کە جێگیرن و مشتومڕی زیاتر لەخۆ ناگرن..، ئەگەر لە هەر شوێنێکیش ئاماژە بدەم بە هەر ڕاستییەکی زانستی کە لە سەداسەد چەسپاو نییە ئەوا ڕوونکردنەوەی زیاتری لەسەر دەدەم.

هەندێ دەقی زۆر کەمی قورئانیمان هەن کە هێشتا زانستی نوێ نەیسەلماندون، جا لەگەڵ باسکردنیان ئاماژە بەو بەڵگانەش دەدەین کە ئەمڕۆ لەبەردەست دان و زانایان بەرەو ئەو ڕایە دەبەن کە ئەگەری سەلماندنیان بەهۆی زانستی هاوچەرخەوە زۆر بەهێزە. بۆ نمونە یەکێ لە دەقە قورئانیەکان ئاماژە بەوە دەکات کە ژیان بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئاو:

﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ (الأنبياء: ٣٠)[٧]

---

[٧] ﴿لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە (ئاو، زۆربەی پێکهاتەی لەشی ئادەمیزادو زیندەوەران و ڕووەك پێکدەهێنێت)﴾.

بوونی ئەم ڕاستیە زانستیانە لە قورئانی پیرۆزدا مانای ئەوە ناگەیەنیّ کە قورئان کتێبێکی زانستیە بەڵکو لە ڕاستیدا باشترین کتێبی ئاینیە و بۆ مەبەستی زانستی نەنێردراوە، بۆیە هەر کاتیّ قورئانی پیرۆز بانگهێشتی مرۆڤەکان دەکات بۆ ئەوەی لە دروستکراوەکان و دیاردە سروشتیە جۆراوجۆرەکان ڕابمێنن، مرۆڤ زۆر بە سێنایی لەوە حاڵی دەبیّ کە مەبەست لێی جەخت کردنەوەیە لە توانستی مەزن و بیّ سنووری خوا. لە ڕاستیدا دەبیّ ئەو ئاماژە قورئانیانەی کە پەیوەستن بە زانستەوە بە یەکیّ لە خەلاّتەکانی خوا بزانین کە ئەمڕۆ بەها و گرنگیەکەی لە چەرخێکدا دەدرەوشێتەوە کە بیّ بڕوایی تێکڕای کۆمەڵگای مرۆڤایەتی تەنیوەو دەیەویّ ڕەگی بڕوا بوون بە خوا هەڵتەکێنیّ بە بانگەشەی ئەوەی کە گوایە بیّ بڕوایی لەسەر زانست بنیات نراوە، هەرچەندە کە قورئان هیچ پێویستی بە خاسیەتی دەرئاسای لەو جۆرەش نیە تاوەکو دەرئاسایی خۆی نیشان بدات، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو وتە زانستیانەی کە لە قورئاندا ئاماژەیان پێدراوە لایەنێکی تایبەتمەندی سروشی ئیسلامین کە لە ئینجیل و تەوڕاتدا وەدی ناکرێن.

بە درێژایی توێژینەوەکەم هەوڵم داوە تەواو بابەتیانە بدوێم، چونکە پێم وایە توانیومە لە توێژینەوەی قورئاندا بابەتی بم بە ئەندازەی ئەوەی کە دکتۆرێك بابەتی یە لە کردنەوەی فایلی نەخۆشێکدا. بە مانایەکی تر تەنها بە شیکردنەوەیەکی وریایانەی سکالاکانی نەخۆش دەتوانین بە وردی نەخۆشیەکەی دیاری بکەین. پێویستە دان بەوەدا بنێم کە پاڵنەری یەکەمم بۆ ئەم هەنگاوە بریتی نەبوو لە بڕوا بوونم بە ئیسلام، بەڵکو ئارەزوی گەڕانم بوو بەدوای ڕاستی. ئەمەش ئەوەبوو کە بینیم دوای تەواو بوونی لێکۆڵینەوەکەم، بۆیە ئەو کاتەی کە توێژینەوەکەم تەواو کردو گەیشتمە ڕاستیەکان، ئەو بڕوایەم بۆ دروست بوو کە قورئان پەرتوکی ڕاستەقینەی خواییە.

## ڕەسەنایەتیی قورئان

بەر لەوەی بچینە نێو کرۆکی بابەتەکەوە، خاڵێکی زۆر گرنگ هەیە دەبێ ئاماژەی پێ بدەین، ئەویش بریتیە لە ڕەسەنایەتیی دەقە قورئانیەکان.

ئاشکرایە کە دەقەکانی قورئان بە دوو شێوە بوون: یەکەم بە شێوەی زارەکی، ئەمەش لە ماوەی دابەزینی دا لە لایەن پێغەمبەر (د.خ) و هەندێ لە هاوەڵانی کە لە دەوری بوون و ئەزبەریان دەکرد، دووەم بە شێوەی نوسراو کە لە لایەن کەسانی تایبەت لە هاوەڵانی پێغەمبەر دەنوسرانەوە. پرۆسەی دابەزینی قورئان ماوەی بیست و سێ ساڵی خایاند و لەو ماوەیەدا چەندین دانەی پچڕ پچڕی لێ نوسرایەوە، تا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەبوبکردا (ڕەزای خوای لەسەر بێ) واتە ساڵێك دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ) بە یاداشتی ئەو کۆپیەکی ڕەسمی قورئانی پیرۆز نوسرایەوە.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بە خاڵێکی زۆر گرنگ بکەین، ئەویش ئەوەیە کە ڕەسەنایەتی ئەو دەقەی ئێستای قورئانی پیرۆز دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئامادەسازیانەی کە لە کاتی نوسینەوەی یەکەم دانەی فەرمی قورئاندا جێبەجێکراون. ئەو ئامادەسازیەی ئەو

کاتیش بریتیبووە لە پێداچوونەوەی قورئان هەم لە لایەن ئەو کەسانەی کە تەواوی قورئانی پیرۆزیان لەبەر بووە و هەمیش بە پێی ئەو کۆپیە پچرپچڕانەش کە ئەو کات لەبەر دەست بوون. لە سەردەمێکدا کە کەس توانای نوسین و خوێندنەوەی نەبوو، لەبەرکردن گرنگی خۆی هەبوو، ئەمە لە کاتێکدا پێویستیی نوسینەوەی قورئان لە ناو خودی دەقەکانی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە. پێنج ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی "العلق" کە یەکەمین ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزن بۆ سەر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دابەزیون بە ڕونی ئاماژەیان بەم بابەتە داوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ * الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ * عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ (العلق ١-٥)[٨]

بە پێی لێکدانەوەی (حەمیدوڵا) ئەم وشانە وەسفی قەڵەم دەکەن وەکو ئامراز و هۆکارێك بۆ زانیاری مرۆڤ.

---

٨ ﴿ئەی موحەممەد بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروستکردووە* ئادەمیزادی لەچەند خانەیەکی هەڵواسراو لەناو منداڵدان دا دروستکردووە* بخوێنە لەکاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە* ئەو زاتەیە کە بە هۆی قەڵەمەوە زانست و زانیاری فێر کردووە* ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیون﴾.

دوای ئەوە خەلیفە عوسمان هات، کە دوازدە ساڵ دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بوو بە خەلیفە و تاوەکو ٢٣ ساڵ دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەردەوام بووە. لەماوەی دوو ساڵی یەکەمی فەرمانڕەوایی ئەم خەلیفەیە، حەوت کۆپی تر لەسەر کۆپیە ڕەسمیەکە لەبەرگیرانەوەو بەسەر ڕوبەرێکی فراوانی سەر ڕوی زەویدا دابەشکرا کە لەژێر فەرمانڕەوایی ئیسلامی دا بوون. لەو کاتەدا هەموو کۆپیە نارەسمیەکان لەناو بران و، هەموو کۆپیەکانی دواتر تەنها لەسەر ئەو حەوت کۆپیە وەردەگیرانەوە.

لە کتێبەکەمدا (کتێبی پیرۆز و قورئان و زانست) ئاماژەم بە هەندێ دەقی نوسراوی قورئانی کردووە کە بۆ پێش کۆچکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەگەڕێنەوە، ئەم دەقانە ئاماژە بە نوسینەوەی قورئان دەکەن پێش بەجێهێشتنی مەکە لە لایەن پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە شایەتحاڵی زۆر هەن لەسەر نوسینەوەی دەقە قورئانیەکان ڕاستەوخۆ دوای دابەزینیان.

مامۆستا (جاك برێك) شتێکی گرینگی پێ ڕاگەیاندم، ئەویش ئەوەیە کە جیاوازیەکی گەورەیە هەیە لە نێوان دەقەکانی ئینجیل و

تــەورات و ئــەو ڕاسـتی و ڕوداوانــەی کــە باسـی لێـوە دەکـەن. بـا ئــەوەشمان لــەیاد نەچـێت کـە ئــەمڕۆ ژمارەیـەک دەستنوسـی قورئانمان لەژێر دەستدا هەن کە مێژوەکەیان بۆ کاتێکی زۆر نزیک لە ساتی هاتنەخوارەوەی سروش دەگەڕێتەوە.

یەکێکی تر لەو خاڵانەی کە بەلامەوە گرنگە، ئەوەیە کە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە دەقە قورئانیەکان دا دەقـی وامـان بەرچـاو دەکـەون کە ڕاستیگەلێکی زانستی بە خۆوە هەڵدەگرن، بەڵام لە کۆنـدا مـرۆڤ نەیتوانیوە پـەی بـەو مانـا زانـستیە قووڵـە بـەرێت، بۆیـە تـەنها بـە شێوەیەکی ڕوکەش ڕاڤەی کردووە، کە لە هەنـدێ حاڵەتـدا بووەتـە هۆی ئـەوەی ماناکانیـان تـەواو نـاڕوون بـن و تێگەیـشتنی ئەسـتەم بێـت. هەرچـەندە بڕواکردنیـشی ئەسـتەمە، بـەڵام یـەکێکی تـر لـە سیفەتە ناوازەکانی قورئانی پیرۆز ئەوەیە کە ئەگەر هاتو بـچوکترین گۆڕانکـاری لــە دەقــەکانی قورئــان کرابوایــە ئــەوا لێکدانــەوەو تێگەیشتنی ئەو دەقە ئیعجازیانە لەدەستی مرۆڤ دەردەچوون و بـە شـێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی پێکەوەسـازانی نێـوان دەقــەکان تێـک دەچوو. خۆ ئەگەر هەر گۆڕانکاریەک لەم دەقانە کرابا ئەوا ئەو کاتە نەماندەتوانی هەماهەنگی لـە نێـوان قورئـان و زانـستدا بدۆزینـەوە. بوونی ئەو دەقانەش کە بە سەراپای قورئانی پیرۆزدا بڵاوبوونەتەوە

لەبەرچاوی هەر لێکۆڵەرەوەیەکی بێلایەن بەڵگەگەلێکی زەقن لەسەر ڕەسەنایەتیی قورئانی پیرۆز.

قورئانی پیرۆز سروشێکە کە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا بۆ پێغەمبەر دابەزێنراوەو ئەو ماوەیەش دەکرێتە دوو بەش کە بە کۆچکردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێ) لێك جیا دەکرێنەوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەمە، شتێکی سروشتیە کە کۆمەڵێك ڕازو بیرۆکەی وا لەم کتێبەدا بدۆزرێنەوە کە ئامازەی زانستیان تێدایە، لە توێژینەوەیەکی وەك ئەوەی کە ئێمە کردوومانە پێویست بوو لەسەرمان کە ئایەتەکان بە پێی بابەت دابەش بکەین و پاشان سورەت بە سورەت کۆیان بکەینەوە.

چۆن پۆلێن بکرێن؟ لە قورئانی پیرۆزدا هیچ ئاماژەیەکم نەدۆزیە لە بارەی چۆنیەتی پۆلێن کردنی بابەتەکانەوە بۆیە بڕیارمدا کە خۆم پۆلێنیان بکەم و بیانخەمەڕوو.

پێم وایە یەکەم بوار کە دەبێ باسی بکەم وەدیهێنانە. لێرەدا دەبێ تیشك بخەمە سەر ئەو ئایەتانەو ئەو ڕاستیە زانستیانەی کە باس لە دروست بونی گەردوون دەکەن، پاشان ئایەتەکان بۆ ئەم بابەتانە دابەش دەکەم: ئەستێرەناسی و زەوی و جیهانی ئاژەڵ و ڕوەك و هەروەها مرۆڤ و بە تایبەتیش وەچەخستنەوەی مرۆڤ. جگە

لەمە، پێم باش بوو کە بەراوردێك لە نێوان گێڕانـەوەکانی قورئـان و کتێبـی پـیرۆز بکـەم لەمـەڕ هەنـدێ ڕوداو کـە لـە هـەردوو کتێبـدا باسـکراون، ئەمـەش لـە ژێـر ڕۆشـنایی زانـستی ئـەمڕۆ. ئـەم بەراوردەشمان لـە بابەتـەکانی وەدیهێنـان و لافاوەکـەی سـەردەمی نـوح پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) و سـەرکەوتنی موسـا (درودی خوای لەسـەر بـێ) و نقومبـوونی فیرعـەون دا ئەنجامـداوە. هۆکاری ئەوەش کە تەنها ئەو بابەتانەمان هەڵبـژاردووە بـۆ بـەراورد کردن ئەوەیە کە ئەمڕۆ زانستی پێویست تەنها لـەبارەی ڕاڤـەکردنی ئەم بابەتانەدا لەبەردەست دان.

# وەدیهێنانی گەردوون

لە لێکۆڵینەوەمان لە قورئانی پیرۆز ڕاستییەکی ئێجگار گرنگمان بۆ دەرکەوت، ئەویش بوونی جیاوازیەکی بەرچاوە لە نێوان گێڕانەوەکانی قورئان و کتێبی پیرۆز، بە پێچەوانەی ئەو بیروبۆچونە هەڵەیەی کە زۆرجار نوسەرە ڕۆژئاواییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن و دەڵێن قورئان و کتێبی پیرۆز وەك دوو هێڵی هاوتەریبن، ئەمەش بەوەی کە تەنها جەخت لە سەر خاڵە وێکچووەکان دەکرێن و چاو لەو جیاوازیە بەرچاوەی کە هەیانە دەنوقێنرێت. دەکرێ هۆکارەکەشی بریتی بێ لە شێواندنی ڕاستیەکان.

کاتێ باسی وەدیهێنان دەکرێ، ڕۆژئاواییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە موحەممەد(دروودی خوای لێبێ) ئەو ئاناژانەی نێو قورئانی پیرۆز کە باسی وەدیهێنان دەکەن لە کتێبی پیرۆزەوە وەرگرتووە. بۆ نمونە لە بارەی وەدیهێنانی زەوی لە شەش ڕۆژدا، دەکرێ ئەو بیرۆکەی کتێبی پیرۆز کە دەڵێ زەوی لە شەش ڕۆژان

وەدیهات و ڕۆژی حەوتەم خودا حەسایەوە، بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو ئایەتەی سورەتی (الأعراف) کە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ (الأعراف-٥٤)[٩].

دەبێ ئاماژەش بەوە بدەین کە ڕاڤەکارە نوێیەکان وشەی "أيام" (ڕۆژان) بە مانای ماوەیەکی درێژ یان چەند زەمەنێك لێك دەدەنەوە نەك بە مانای بیست و چوار سەعات.

ئەوەی بەلای منەوە گرنگی یەکی بنەڕەتی هەیە ئەوەیە کە بە پێچەوانەی کتێبی پیرۆز قورئان هیچ زنجیرەو ڕیزبەندیەك بۆ دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی دانانێت، بەڵکو لەباسی وەدیهێنانی گەردوون دا بەگشتی ئاماژە بە وەدیهێنانی زەوی پێش ئاسمانەکان و وەدیهێنانی ئاسمانەکان پێش زەوی دەکات. هەروەك خوای گەورە لە ئایەتی چواری سورەتی (طه) دەفەرموێ:

﴿تَنْزِيلًا مِمَّنْ خَلَقَ الْأَرْض وَالسَّمَاوَات الْعُلَى﴾ (طه- ٤)[١٠]

---

٩ ﴿بێگومان پەروەردگارتان (الله) یە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوی یە لە ماوەی شەش ڕۆژدا (مەگەر هەر خۆیشی بزانێت ئەو ڕۆژانە ماوەیان چەندە)﴾.

١٠ ﴿قورئان لەلایەن زاتێکەوە بەش بەش دابەزیوە، کە زەوی دروست کردووەو ئاسمانە بڵندەکانی بەدیهێناوە﴾.

لەڕاستیدا ئەوەی کە لە قورئانی پیرۆز وەردەگیرێ بریتیە لەوەی کە ئاسمان و زەوی بە شێوەیەکی هاوتەریب گەشەیان کردووە، هەروەها قورئان زانیاری تری بنەڕەتی دەدات بەدەستەوە کە باس لە بوونی دوکەڵێك (دخان) دەكات، ئەم زانیاریەش تایبەتە بە قورئانی پیرۆز و تەنها قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێدەدات. لەپاڵ ئەمانە، قورئان باسی ئەوە دەكات كە ئەگەرچی سەرەتا توخمەكان لە ناویەكدا چڕبوبوونەوە (رتق) بەڵام دواتر لێكجیابوونەوە و پەرشو بڵاوبوون (فتق). ئەم بیرۆكەو زانیاریانە لە سوڕەتی (فصلت) و سوڕەتی (الأنبياء) دا باسكراون:

﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾ (فصلت-١١)[١١]

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا﴾(الأنبياء٣٠)[١٢]

بە پێی زانستی هاوچەرخ، پرۆسەی لێكجیابوونەوە بووە هۆی دروستبوونی چەند جیهانێك، ئەم بیرۆكەیەش دەیان جار لە

---

١١ ﴿ئینجا ویستی ئاسمانەكان ڕێكبخات و دروستی بكات لە كاتێكدا كە دوكەڵ بوو﴾.

١٢ ئایا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون نەیانبینیوەو بۆیان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەكان و زەوی یەك پارچەبوون لەوەودوا لێكمان جیا كردنەوە (كە ئەمە ئاژەیە بۆ ئەوەی كە ئەم ڕاستەقینە زانستییە لەلایەن ئەوانەوە پەی پێ دەبرێت).

قورئانی پیرۆزدا بەرچاودەکەوێت. سەیرێکی سورەتی (الفاتحة) بکە لە قورئانی پیرۆزدا کە ئەفەرموێت: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الفاتحة-٢). سەرچاوە قورئانیەکان وەك دوو هێڵی هاوتەریب تەواو کۆکن لەگەڵ زانستی هاوچەرخ لەبارەی ئەوەی کە گەردوون لە سەرەتادا دوکەڵ بووەو دواتر بەهۆی لێکجیابوونەوەی توخمەکان کەشکەشانەکان دروست بوون و پاشانیش ئەستێرەکان و دواتریش هەسارەکان لەم ئەستێرانە دروست بوون. ئاماژە قورئانیەکان لە پاڵ باسکردنی وەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی، باسی شتێکی تریش دەکەن کە لە نێوان ئاسمانەکان و زەویدا هەیە. هەروەك خوای گەورە لە سورەتی (الفرقان) دا دەفەرموێ :

﴿الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ (الفرقان–٥٩)[١٢]

پێدەچێت ئەوەی کە لە نێوان ئاسمانەکان و زەویدا وەدیهێنراوە تەواو ڕێکبێتەوە لەگەڵ ئەو دۆزینەوە زانستیە نوێیەی کە دەریخستووە پردێکی ماددی هەیە لەنێوان تەنە

---

١٢ ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لە نێوانیاندایە لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروستی کردووە.

گەردوونیەکاندا، ئەو پـردە مادییـە دەکەوێتـە نێـوان و چـواردەوری هەر تەنێکی ڕێکخراوی ئەم سیستمە گەردوونی یەدا[١٤] .

ئەم لێکۆڵینەوە پوخت و کورتـەی ئاماژەکـانی قورئـان لـەبارەی وەدیهێنانــەوە بــە ڕوونــی ئــەوەمان بــۆ دەردەخــات کــە تــا چ ئەندازەیــەکی گــەورە دەقــەکانی قورئــان و زانیاریــەکانی زانــستی هاوچەرخ کۆکن، بە پێچەوانەوە دەقە یەك لەدوای یەکەکانی کتـێبی پـیرۆز نـاگونجێ بـەهیچ شـێوەیەك قـەبوڵ بکـرێن. بـۆ نمونـە لـە (گێنەســیس: 1:9–19)[١٥]دا دەڵــێ: زەوی لــە ڕۆژی ســێیەمدا

---

١٤ زانایانی مسوڵمانی هاوچەرخ لە ڕاڤەی زانستی ئەم ئایەتەدا دەریانخستوە کە شوێن و کات بەبێ ماددەو وزە بوونیان نیە، هەروەها لە گەردوون دا بۆشایی نییە بەڵکو پردی ماددەو وزە بوونی هەیە کە زاناکان ئەم ماددەو وزەیە بە دۆخی چوارەم ناو دەبەن و پێی دەڵێن (دۆخی پلازما)، پلازما بریتیە لە گازێکی ئایۆنی وا کە ئەلیکترۆنەکانی سەربەخۆن و بە گەرد و گەردیلەوە پەیوەست نین، جا ئەم جۆرە وزەو ماددەیە لەنێوان و چواردەوری هەرکام لە خۆر و زەوی، هەروەها لەنێوان و چواردەوری هەموو تەنەکانی کۆمەڵەی خۆرو، تەنانەت لەنێوان و چواردەوری ئەستێرەو کەشکەشانەکانیشدا هەیە، بگرە هەر تەنێکی تری هەستپێکراوی ئەم گەردوونە.

زانایانی هاوچەرخ بەو ماددەیەی کە لە چواردەوری هەسارەکاندا هەیە دەڵێن Circum-Planetarymatter، نێوان هەسارەکان Inter-Planetarymatter ، چواردەوری ئەستێرەکان Cirlum-SyellarMarrer، نێوان ئەستێرەکان Inter-StellarMatter، چواردەوری کەشکەشانەکانCircum-galacterMatter، نێوان کەشکەشانەکان Inter-galacticmatter.,

(وەرگێڕ)

١٥ (گێنەسیس) بریتیە لە یەکەم کتێبی پەیمانی کۆن (تەورات) کە باسی لە وەدیهێنانی گەردوون دەکات (وەرگێڕ – Webster Dictionary)

دروستکراوە پێش وەدیهێنانی ئاسمان کە لە ڕۆژی چوارەمدا وەدیهێنراوە، لە کاتێکدا ئەو ڕاستییە ئاشکرایە کە ئەم هەسارەیەی ئێمە سەرچاوەی دروستبوونەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەستێرەکەی خۆی کە خۆرە. لێرەدا چۆن دەتوانین بڵێین کە موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) (کە ئەگەر وایە، نوسەری قورئانە) سودی لە دەقەکانی کتێبی پیرۆز وەرگرتووە؟!. بانگەشەی لەم جۆرە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە گوایە موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) خۆی هەوڵی ڕاستکردنەوەی دەقەکانی کتێبی پیرۆزی داوە تاوەکو بگاتە ڕاستیەکان لەبارەی وەدیهێنانی گەردوون، ئەمە لە کاتێکدا کە زاناکان چەندین سەدە دوای مردنی ئەو بەم ڕاستیانە گەیشتن!.

## گەردووnnاسی

هەرکاتێ لەگەڵ ڕۆژئاواییەکان باسی ئەو وردەکاریەم دەکرد کە قورئانی پیرۆز لەبارەی گەردونناسیەوە ئاماژەی پێ کردووە، بە شێوەیەکی گشتی وەڵامیان ئەوەبوو کە "ئەمە شتێکی ئاساییە، چونکە عەرەبەکان لەم بوارەوە زۆر پێشی ئەوروپیەکان دۆزینەوەی گرنگیان هەبووەو، لەم بوارەدا پێشکەوتوو بوون". بەڵام ئەم وەڵامە هەڵەیەو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بێئاگاییان لە مێژوو، جارێ بەر لە هەموو شتێك، پێشکەوتنی زانستی عەرەبەکان بە ماوەیەکی زۆر دوای دابەزینی قورئان بوو. سەرەڕای ئەمە، لە چڵەپۆپەی ئەو پێشکەوتنە زانستییەی کە لە ژیاری ئیسلام دا هەبوو هیچ مرۆڤێك نەیتوانی دەقێك بنوسێ لەبارەی ئاسمانەکانەوە کە بتوانرێت لەگەڵ دەقەکانی قورئاندا بەراورد بکرێ. ئەم بوارە ئەوەندە زۆر لەخۆی هەڵدەگرێ کە لێرەدا دەتوانین تەنها پوختەیەکی لێ باس بکەین.

# ڕۆژو مانگ

کتێبی پیرۆز کاتێك کە باسی ڕۆژو مانگ دەکات وەك دوو ڕوناکی باسیان دەکات کە تەنها لە قەبارەدا جیاوازن، بەڵام قورئانی پیرۆز لە باسی مانگ و ڕۆژدا لێکیان جیا دەکاتەوەو دوو وشەی جیاشیان بۆ بەکاردێنێ، بۆ مانگ وشەی (نور) واتە ڕوناکی بەکاردێنێ و بۆ ڕۆژیش وشەی (سراج) بەکاردێنێ کە بە مانای (چرا) دێت:

﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا * وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجاً﴾ (نوح ١٥-١٦)[١٦]

مانگ تەنێکی بێ گیانە کە تەنها وێنەی ڕوناکی دەداتەوە، لە کاتێکدا ڕۆژ تەنێکی ئاسمانیە کە لە سوتانێکی بەردەوامدایە و گەرمی و ڕوناکی بەرهەمدێنێت.

---

١٦ ﴿ئایا سەرنجتان نەداوە چۆن خوا حەوت چین ئاسمانی دروستکردووە؟! * مانگی کردۆتە هۆی ڕوناکی تیایانداو خۆریشی داگیرساندووە﴾.

# ئەستێرەو هەسارەکان

لـــە قورئانـــدا لـــە ســـورەتی (الطـــارق) ئایـــەتی (٣)، وشـــەی ئەستێرە(نجم) لەگەڵ ناوەڵناوی (الثاقب) دا هاتووە، کە ئەوە دەردەخـات ئەسـتێرە دەسـوتێ و خۆشـی دەبێتـە سـوتەمەنی گڕەکـەی، لـە ئـەنجامی ئەمـە لـەناو سـێبەر و تـاریکی شـەودا وەدەردەکەوێت. لە ڕاستیدا بە ماوەیەکی زۆر دوای ئەم ئایەتە زانستی هاوچەرخ بۆی دەرکەوت کە ئەستێرەکان ئەو تەنە ئاسمانیانەن کە وەکو خۆر خۆیان ڕوناکی دروست دەکەن.

هەر لە قورئانی پیرۆزدا زاراوەیەکی تر بەکاردێت، ئەویش (کوکب) ە کە بە مانای هەسارە دێت و، ئەو تەنانەن کە خاوەنی ڕوناکی خۆیان نین بەڵکو ئەمانە ڕوناکی خۆر دەدەنەوە.

(إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ) (فصلت-٦)[17].

---

١٧ ﴿بێگومان ئێمە ئاسمانی دنیامان ڕازاندۆتەوە بە جوانی و ڕۆشنی ئەستێرەو هەسارەکان﴾.

# خولگەکان

ئەو ڕێسایانەی کە سیستەمە ئاسمانیەکانیان لەسەر بەندە ئەمڕۆ ئاشکراو زانراون. کەشکەشانەکان بە پێی شوێنی ئەستێرەکان و هەسارەکان لە چوارچێوەی خولگەی دیاریکراودا هاوسەنگ کراون، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە کاریگەری هاوبەشی هێزی کێشکردن لە نێوانیاندا هەیە، کە لە لایەن بارستەی خودی ئەم تەنانەو خێرایی جوڵەکانیانەوە بەرهەمدەهێندرێن، ئایا ئەوە هەمان ئەوە نیە کە قورئانی پیرۆز باسی دەکات و تا ئەم ڕۆژگارە مرۆڤ نەیدەتوانی لێی حاڵی بێت و تێیبگات؟. خوای گەورە لە سورەتی (الأنبیاء) دا دەفەرموێ:

﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ (الأنبیاء -٣٣)[18]

ئەو وشە عەرەبیەی کە بە مانای جوڵە لە قورئانی پیرۆزدا بەکارهاتووە بریتیە لە وشەی "یسبحون"، کە بە مانای جوڵەیەک دێت لە ئەنجامی جوڵاندنی لاشە دروست دەبێت، جا چ جوڵاندنی لاق بێت بۆ ڕۆیشتن لەسەر زەوی یان کرداری مەلەوانی بێت لە

---

١٨ ﴿هەر ئەو زاتەیە کە شەوو ڕۆژی بەدی هێناوە، خۆرو مانگیشی دروستکردووە، هەریەکەیان لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە (زەوی بەدەوری خۆرداو مانگیش بە دەوری زەوی دا)﴾.

ئاودا. لە حاڵەتی بە کارهێنانی وشەی "یسبحون" بۆ تەنە ئاسمانیەکان ناچارین بە پێی مانا سەرەکیەکەی خۆی لێکی دەینەوە کە مانای "گەشتکردن بە هۆی جوڵەی خۆی" دێت.

لە کتێبەکەمدا (کتێبی پیرۆزو قورئان و زانست) هەندێ زانیاری زانستیی پوختم لەبارەی جولآنی تەنە ئاسمانیەکان باسکردووە. ئەم زانیاریانە زیاتر لەبارەی مانگن و کەمتر لەبارەی خۆرن.

# شەوو ڕۆژ

لە ڕاستیدا ئەو ئامـاژە قورئانیانـەی کـە بـاس لـە بـەدوای یەکـداهاتنی شـەو و ڕۆژ دەکـەن، ئەگـەر لـە چوارچـێوەی چـەند دەستەواژەیەکی زۆر ورد و گونجاو نەبونایە کە ئەمڕۆ ڕێك بـۆ ئـەم دیاردەیـە بەکاردەهێنـدرێن، ئـەوا زۆر سـادەو سـاکار و ئاسـایی دەبوون[19]. قورئانی پـیرۆز فرمـانی "کُـوِّرَ" بـەکاردێنیّ لـە سـوڕەتی (الزمر) بۆ وەسفکردنی ئـەو دیاردەیـەی کـە چـۆن شـەو بەشـێوەی کەوانە ڕۆژ بەدوای خۆی دەهێنیّ و ڕۆژیـش بـە هـەمان شـێوە شـەو بەدوای خۆیدا دەهێنێت[20].

﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ (الزمر-٥)[21]

---

١٩ نوسەر لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە قورئان چەند دەستەواژەیەکی زۆر وردی بەکارهێناوە بۆ باسکردنی ئەو دیاردە گەردوونیە، کە ئەوکات خەلك ماناکانی تێنەدەگەیشتن. بەلاّم ئەمڕۆ لە سایەی پێشکەوتنە زانستیەکان، ئەم ئاماژە زانستیانەی کە وەسفی ئەو دیاردە گەردوونیە دەکەن ڕێك هەمان ئەو دەستەواژانە بەکاردێنن لە قورئانی پیرۆزدا بۆ ئەم دیاردەیە بەکارهاتوون، ئەمەش ئیعجاز و گەورەیی قورئان دەردەخات (وەرگێڕ).

٢٠ وشەی (کُوِّر) گونجاوترین و ڕێکترین وشەیە لە زمانی عەرەبی دا کە قورئان بەکاریهێناوە بۆ بەدوای یەکداهاتنی ڕۆژ و شەو، لە بنەڕەتدا ئەم وشەیە واتا هێنانی شتێك بەسەر ئەویتریان و جێگۆڕکیّ پێکردنیان، هەروەکو چۆن تۆپێك کە دوو لای هەیە، لە کاتی خولاندنەوەی دا لایەکیان ئەویتریان بەدوای خۆی دەهێنێت و جێی دەگرێتەوە، ڕۆژو شەویش بەهەمان شێوەیە، ئەمەش ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆی قورئانە بۆ خڕێتی زەوی (وەرگێڕ).

٢١ ﴿ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی دروستکردووە، بەشێوەی کەوانەیی شەو بەسەر ڕۆژدا دەهێنێت، بەهەمان شێوەی کەوانەیی ڕۆژیش بەسەر شەودا دەهێنیّ (کە ئەمە خۆی بەلگەیەکی قورئانیە لەسەر شێوازی خڕیی زەوی)﴾.

وشەی "کوِرَ" لە بنەچەدا بە مانای خولاندنەوەی مێزەر دێت بە چـواردەوری سـەردا، کـە لـە ڕاسـتیدا بـەراوردکردنی بـە دوای یەکـداهاتنی شـەووڕۆژ و پێـچانەوەی مێـزەر بـەدەوری سـەردا بەراوردێکی ژیرانەو لۆژیکیانەیە، ئەمەش بە لەبەرچاوگرتنی ئـەوەی کە لەساتی دابـەزینی ئـەم ئایەتـەدا هـیچ زانیاریـەکی گەردوونناسـی ئەوتۆ لەئارادا نەبووە بـۆ ئـەوەی پـەی بـە بـەراوردێکی لـەم جۆرە ببات. بۆیـەش تـاوەکو مـرۆڤ نەچـوە سـەر مـانگ و بەچـاوی خـۆی تێبینـی ئـەوەی نـەکرد کـە زەوی بـەدەوری چـەقەکەی خۆیـدا دەخولێتەوەو نیوە تاریکەکەی زەوی پێچ دەخواتەوە بەدوای نیـوە ڕوناکەکـەی زەوی و بـە پێـچەوانەوەش، ڕاسـتیەتی ئەمـەی بـۆ نەچەسپا.

# خاڵی سرەوتنی خۆر

بابەتی جێگیریی شوێنی خۆر لە قورئانی پیرۆزدا زۆر بە ڕوونی باسکراوە. خوای گەورە لە سورەتی (یس) لە ئایەتی (٣٨) دا دەفەرموێ :

﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ (یس-٣٨)[٢٢]

وشەی (مُستَقَر) بە مانای (جێگیر، شوێن نەگۆڕ) دێت، کە ئاماژەیە بۆ کات و شوێنێکی دیاریکراو. زانستی گەردونناسیی هاوچەرخ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لە ڕاستیدا کۆمەڵەی خۆر بە خێرایی ١٢ میل لە چرکەیەکدا بە ئاراستەی خاڵێک دەجوڵێتەوە کە دەکەوێتە بورجی هەرقل (چینی ئەلفا) کە شوێنەکەی بە وردی دیاریکراوە، تەنانەت گەردونناسەکان ناوێکیشیان بۆ دیاری کردووەو پێی دەڵێن خاڵی سرەوتنی خۆر.

---

٢٢ ﴿خۆریش لە گەردش و سوڕانەوەی خی دا بەردەوامەو بەرەو سرەوت دەچێت، یاخود بەدەوری چەقی خۆیدا دەسوڕێتەوە، بێگومان ئەوە توانای زاتێکی باڵادەست و زانا دەردەخات (کە هەموو شتێکی بە ڕێك و پێکی دروستکردووە)﴾.

# فراوانبونی گەردوون

لە سورەتی (الذاريات) خوای گەورە ئاماژە بە یەکێ لە شکۆدارترین دۆزینەوەکانی زانستی نوێ دەکات کە ئەویش فراوان بوونی گەردوونە:

﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ (الذاريات-٤٧)[٢٣]

فراوان بوونی گەردوون بۆ یەکەم جار لە ڕێگەی تیۆری گشتی ڕێژەییەوە[٢٤] ورووژێندرا، پاشانیش زاناکانی فیزیای گەردونناسی لە ڕێگەی هاوکێشە ژمێرەییەکانەوە پاڵپشتییان لێ کرد. جوڵەی ئاسایی ڕوناکی ئەستێرەکان بەرەو لاسوورەکەی شەبەنگ بەهۆی دوری نێوان کەشکەشانێك لەگەڵ کەشکەشانێکی تر دیاریدەکرێت، بەمەش دەردەکەوێ کە قەبارەی گەردوون هەمیشە لە فراوانبووندایە.

---

[٢٣] ﴿ئێمە ئاسمانمان بەدەستی قودرەتی خۆمان دروستکرد، بەردەوامیش گەورەی دەکەین و فراوانی دەکەین﴾.

[٢٤] ئەو تیۆرە بەگشتی لە لایەن ئەلبێرت ئاینشتاین Albert Anestin دامێنرا.

## داگیرکردنی بۆشایی گەردوون

لە دەستکەوتەکانی زانستی نوێ بریتیە لە داگیرکردنی گەردوون کە بە گەشتکردنی مرۆڤ بۆ سەرمانگ ئەم دەستکەوتە هاتەدی. بێگومان هەرکەسێك سورەتی (الرحمن) لە قورئانی پیرۆزدا بخوێنێتەوە پێشبینی ئەو ڕوداوەی بۆ دروست دەبێ، وەك خوای گەورە لە ئایەتی ٣٣ دا دەفەرموێ:

﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنْفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانْفُذُوا ۚ لَا تَنْفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾ (الرحمن-٣٣)[٢٥]

جا لە ڕاستیدا دەسەڵاتی گەشت کردن بۆ بۆشایی ئاسمان تەنها لەڕێی دانەری یاساکان و جوڵێنەری گەردوون وەچنگ دەکەوێ و، ئەم سورەتەش داوا لە مرۆڤ دەکات کە نیعمەتەکانی خوای گەورەی بۆ دەرکەوێ و دانیان پێدا بنێت.

٢٥ ﴿ئەی کۆمەڵی پەری و ئادەمیزاد، ئەگەر دەتوانن بە بەشەکانی ئاسمانەکان و زەوی دا دەرچن، ئەو کارە ئەنجام بدەن، دڵنیاش بن کە ئەو کارە بە هۆی دەزگای ماددی و توانای مەعنەوی یەوە نەبێ ئەنجام نادرێت﴾.

## زەویناسی

با بگەڕێینەوە سەر باسی زەوی، تاوەکو پەردە لابدەین لەسەر هەندێ لەو دەقە سەرسوڕهێنەرانەی قورئان کە باسی هەسارەکەمان دەکەن. ئەو ئایەتە پیرۆزانە تەنها باسی ئەو دیاردە فیزیکیانە ناکەن کە لەسەر زەوی درکیان پێ دەکەین، بەڵکو بە وردی باسی هەموو ئەو زیندەوەرانە دەکەن کە لەسەری دەژین.

وەك هەموو ئەو بوارانەی کە پێشتر ئاماژەمان پێ کردن، لە ڕوی زەویناسیشەوە قورئانی پیرۆز چەمك و دەربڕینی وای هەیە کە زۆر پێشکەوتو ترن لەو زانیارانەی کە لەو سەردەمەدا هەبوون.

لەم سۆنگەیەوە، هەریەك لە ئێمە پێویستە ئەم پرسیارانە لەخۆی بکات: ئایا کەسێکی نەخوێندەوار لە ناوەڕاستی بیابان چۆن توانی تاووتوێی ئەو هەموو بابەتە لۆژیکیانە بکات، لە کاتێکدا کە ئەوکات سەرچاوەی هەموو زانیاریەك ئەفسانەو جادوو بوو؟ ئەی ئەو کەسە چۆن توانی بەوپەڕی لێهاتوییەوە خۆی لە هەموو ئەو بیروڕایانە بە دوور بگرێ کە دوای چەندین سەدە دەرکەوت کە هەڵەن؟!.

## سوڕی ئاو

ئێستا دێینە سەر ئەو ئەو ئایەتە پیرۆزانەی کە باس لە ڕێساکانی زەوی دەکەن. ژمارەیەکی زۆریشم لەو ئایەتانە وەرگرتوون و لە کتێبەکەمدا (قورئان و کتێبی پیرۆز و زانست) بەکارمهێناون، هەروەها گرنگیەکی تایبەتیشم بە سوڕی ئاو داوە لە سروشتدا. ئەمڕۆ ئەم بابەتە تەواو ئاشکرایەو ئەو ئایەتە قورئانیانەش کە ئاماژە بە سوڕی ئاو دەدەن کۆمەڵێك بیرو ڕا دەردەخەن کە تەواو بەڵگەدارن و ئیسپاتکراون، کەچی ئەگەر سەیرێکی ئەو بیرۆکانە بکەین کە ئەوسا لەم بوارەدا باو بوون، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە زیاتر لەسەر بنەمای ئەفسانەو لێکدانەوەی فەلسەفی بنیاتنرابوون نەك لەسەر بنەمای ڕاستییەکان، ئەمەش لە کاتێکدا کە زانیاری تەواو و سودبەخش هەبووە لەبارەی ئاودێری خاك. بۆنمونە، با قورئانی پیرۆز بکەینەوەو بچینە سەر سورەتی (الزمر)، خوای گەورە لە ئایەتی (٢١) دا دەفەرموێ:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ﴾ (الزمر-٢١)[٢٦]

---

٢٦ ﴿ئایا تۆ نەتبینیوەو سەرنجت نەداوە: بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، لەوەو دوا لەناو ناخی زەوی دا کۆی دەکاتەوە پاشان بەشێوەی کارێزو کانی دەریدەهێنێت، ئەوسا هەربەو ئاوە کشتوکاڵی هەمەجۆرو هەمەڕەنگ دەڕوێنێت﴾.

ئەم بیرۆکانە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زۆر سروشتین، بەڵام نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە ماوەیەکی کەم بەر لە ئێستا بیرۆکەی لەم جۆرە باوو نەبوون و بگرە بەهەڵەش لە قەڵەم دەدران. لەسەدەی شازدەهەم بوو کاتێ کە بۆ یەکەم جار (بێرنارد پالیسی) وەسفی سوڕی ئاوی کرد بەشێوەیەکی لۆژیکی مانادار. پێش ئەوکات مرۆڤ وا تێگەیشتبوو کە ئاوی نێو زەریاکان لە ڕێگای باوە ڕوو لە زەوی دەکات و پاشان لە ڕێگای (درزو کونە ئاویەکان Abyss) ەوە دەگەڕێتەوە نێو زەریاکان، ئەمەش هەر لە سەردەمی ئەفلاتونەوە پێی دەگوترا (تارتاروس Tartarus)[٢٧]. لەسەدەی شازدەهەمدا گەورە بیرمەندانێکی وەکو (دیکارت) بڕوایان بەم ئەفسانەیە هەبووە. تەنانەت لە سەدەی نۆزدەهەمیشدا خەڵکی وا هەبووە کە بڕوای بە تیۆرەکەی ئەرستۆ هەبووە کە دەڵێ "ئاو لە نێو ئەشکەوتە سارد و قوڵەکانی چیاکاندا شل بۆتەوەو، لە شێوەی گۆمی ژێر زەوی پەنگی خواردۆتەوە، پاشان دەرپەڕیوەو بوەتە کانی". ئەمڕۆ ئێمە ئەوە دەزانین کە ئەوەی دەبێتە هۆی دروست

---

٢٧ تارتاروس Tartarus لە ئەفسانەی کۆنی یۆنانی دا هاوسەری (جایا) و باوکی (تایفوس و پاڵەوانەکان) بووەو، لە (ئەلیادە)شدا بە زیندانێك وتراوە کە لەژێر زەوی بووەو ئەو کەسانەی تێدا زیندانی کراون کە لە دەست خواوەندی گەورە (زیۆس) یاخی دەبوون، یاخود هەندێکی تر دەڵێن شوێنی سزادانی گوناهباران بووە لەژێر زەمین دا دوای مردنیان. (وەرگێڕ– ویکیپیدیا)

بوونی کانی بریتیە لە دزەکردنی ئاوی باران بۆ ناو زەوی. ئەگەر هەرکەسێك بێت و بەراوردێك بکات لە نێوان ئاوناسی(Hydrology) ئەمڕۆ و ئەو زانیاریانەی لە قورئانی پیرۆزدا هەن، بێگومان لەم بابەتەدا پێکەوە گونجان و ڕێککەوتنێکی بەهادار لە نێوانیاندا بەدی دەکات.

# چیاکان

لە بواری زەویناسیدا، زانستی هاوچەرخ دیاردەی قەتبوون و چین چین بوونی چیاکانی دۆزیوەتەوە، کە بەهۆی ئەم دیاردەیەوەیە چیاکان دروست دەبن. تویکڵی زەوی وەکو سەدەفێکی ڕەقە لە کاتێکدا کە چینە قوڵەکانی شل و گەرمن و بواری ژیانیان تێدا نیە. هەروەها ئەوەش دۆزراوەتەوە کە جێگیری چیاکان بەندە بە دیاردەی چونە ناویەك و چین چین بونەوە. پرۆسەی دروست بوونی چیاکان پەیدا بووە لە ڕێگای چوونە ناو یەکی توێکڵی زەوی بەرەو چینەکانی خوارەوەی زەوی و، بەمەش بنچینەیەکی بەهێز بۆ چیاکان دامەزراوە.

ئێستاش با زانستی نوێ لە گەڵ یەك ئایەتی قورئانی پیرۆز بەراورد بکەین لە نێو چەندین ئایەتی تر، کە ئەوەش ئایەتی (٦,٧) سورەتی (النبأ)ە کە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا * وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾ (النبأ ٦-٧)[٢٨]

٢٨ ﴿ئایا زەویمان وەك لانکە بۆ فەراهەم نەهێناوە؟* (ئایا) کێوەکانمان وەك مێخ بۆ دانەکوتاوە؟ (تا زەوی بپارێزرێت لە فشاری بورکان و ماددە تواوەکانی ناو ناخی، هەروەك تا لەنگەری ڕابگرێت و چەندەها سودی ترتان پێ بگەیەنێت)﴾.

"أوتاد"(stake) واتە ئەو مێخەی کە بە زەویدا دەکوترێ و دەچێتە خوارەوە وەکو ئەو سینگانەی کە بۆ ڕاگیرکردنی ڕەشماڵ بەکاردێن، ئەم مێخانە بناغەی قوڵی چینەکانی زەوین.

لەم بوارەشدا، دیسانەوە وەکو هەموو ئەو بابەتانەی کە پێشتر ئاماژەمان پێکردن، هیچ لێکۆڵەرەوەیەکی زانستی ناتوانێ هیچ دژیەکیەك لە نێوان زانستی هاوچەرخ و قورئانی پیرۆزدا بدۆزێتەوە.

## زیندەوەرزانی

لە دەقە پیرۆزەکانی قورئان، ئەوەی لە هەموو شتێ زیاتر سەرسامی کردووم، ئەو دەقانەن کە لەبارەی زیندەوەرانەوەن، هەم لە بارەی ئاژەڵان و هەم لە بارەی ڕووەکە جیاجیاکان. لە ڕاستیدا پێویستیمان بە کاتێکی زیاترە بۆ ئەم بابەتە بەڵام لەبەر سنورداری کاتەکەمان تەنها چەند نمونەیەکتان بۆ باس دەکەم.

لێرەدا پێویستە جارێکی تریش ئاماژە بەوە بکەمەوە کە تەنها بەم دواییانە، دوای دۆزینەوە زانستی یە نوێیەکان، هەندێ لە مانا زانستیەکانی قورئانی پیرۆزمان بۆ ڕوون بویەوە، لەکاتێکدا کە زۆربەی وەرگێڕان و ڕاڤەکانی قورئان لە لایەن ئەو لێکۆڵەرەوانەوە بووە کە دەستیان نەگەیشتۆتە زانستی ئەمرۆ، هەر بۆیەش زۆر لە زانایان ئەو ڕاڤەو وەرگێڕانانە لە ڕوی زانستیەوە بە ناپەسند دەزانن.

هەندێ دەقی پیرۆزی قورئان هەن کە مانا ڕوکەشەکانیان سادەو ئاسانن، بەڵام ڕازی زانستی سەرسوڕهێنەریان لە نێو خۆدا حەشارداوە. بۆ نمونە، لەو ئایەتەی کە هەر زوو ئاژەمان پێداوە خوای گەورە لە سوڕەتی (الأنبیاء) لە ئایەتی ٣٠ دا دەفەرموێ:

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنبياء ٣٠) [٢٩]

**ئەمەش جوانترین جەخت کردنەوەیە بۆ ئەو ڕاستیە نوێیەی کە بنچینەی هەموو ژیان بریتیە لە ئاو.**

٢٩ ﴿ئایا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون نەیانبینیوەو بۆیان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچەبوون لەوەودوا لێکمان جیا کردنەوە (کە ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەم ڕاستەقینە زانستییە لەلایەن ئەوانەوە پەی پێ دەبرێت) لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە (ئاو، زۆربەی پێکهاتەی لەشی ئادەمیزادو زیندەوەران و ڕووەك پێکدەهێنێت)، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن ( بەو ڕاستییانەو بەو دەستەڵاتە بێسنوورەی ئێمە)؟!﴾.

## ڕووەکناسی

لە سەردەمی پێغەمبەر موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) لە هیچ شوێنێکی سەر ئەم زەویە زانست نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی کە بڵێ هەموو ڕوەکێك نێر و مێی هەیە، بەڵام خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْ نَبَاتٍ شَتَّى﴾ (طه-٥٣)[٣٠]

ئەمڕۆ ئێمە هەمومان ئەو ڕاستیە دەزانین کە هەموو میوەیەك لەو ڕوەکانەن کە سیفەتی ڕەگەزییان هەیە، تەنانەت ئەگەر لەو ڕوەکانەش بن کە ناپیتێنرێن، وەك مۆز. لە سورەتی (الرعد) ئەم دەقەمان بەرچاو دەکەوێ:

﴿وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ (الرعد-٣)[٣١].

---

٣٠ ﴿- لە ئاسمانەوە باران دادەبەزێنێت- کە بەهۆیەوە چەندەها جووت ڕووەکی پێ ڕواندووە﴾.

٣١ ﴿لە هەموو بەرووبومێك جووتی فەراهەم هێناوە لە هەردوو جۆرە﴾.

## کارئەندامزانی

لە بواری کارئەندامزانیەوە (فیزیۆلۆژی)، ئایەتێك هەیە بەلامەوە زۆر گرنگەو سەرنجی ڕاکێشاوم. هەزار ساڵ بەر لە دۆزینەوەی کۆئەندامی سوڕی خوێن، هەروەها نزیکەی ١٣ سەدە بەر لەوەی بزانرێ کە ئەندامەکانی ناوەوە لە ڕێگای پرۆسەی هەرسکردنەوە خۆراکیان بۆ فەراهەم دەهێنرێت، ئایەتێکی قورئانی پیرۆز وەسفی سەرچاوەی پێکهاتەکانی شیر دەکات، ئەمەش بە بونی هەماهەنگی تەواو لەگەڵ ڕاستیە زانستیەکانی ئەمڕۆ.

بۆ تێگەیشتن لەم ئایەتە پێویستە ئەوە بزانین کە هەر لە ناو دەمدا کارلێکی کیمیایی لە نێوان خواردن و ئەنزیمەکاندا ڕوو دەدات، دواتریش لە نێو گەدەو ڕیخۆڵەکان ئەوە کردارە بەردەوام دەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی دەردانی وردە مادده خۆراکیەکان لە شێوەی گەردیی دا کە دواتر لە ڕێگای ڕێژەیەکی بێشومار لە وردە مەمیلەکانی دیواری ڕیخۆڵە دەمژرێن بۆ ناو سوڕی خوێن. خوێن مادده خۆراکیەکان بۆ تەواوی ئەندامەکانی لەش دەگوازێتەوە لە ڕێگای سوڕی خوێنەوە، لە ناو ئەو مادده خۆراکیانەشدا ڕژێنەکانی مەمك هەن کە بەرپرسن لە بەرهەمهێنانی شیر.

بۆ تێگەیشتنمان لە ئایەتگەلێکی لەم جۆرە، کە تا ئەم دواییانەش ماناکانیان ڕوون و ئاشکرا نەبوون، پێویستە سەرەتا لە پرۆسە بایۆلۆژییەکان بگەین.

ئەمڕۆ مانای ئەم ئایەتە قورئانیەی سورەتی (النحل) لێڵ و قورس نییە:

﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ﴾ (نحل-٦٦)[٣٢]

پێکهاتەکانی شیر لە لایەن ڕژێنەکانی مەمکەوە دەردەدرێن و بە هۆی پرۆسەی هەرسکردنەوە لە ڕێگەی سوڕی خوێن خۆراکی پێویستی بۆ دابین دەکرێ. دەستپێکی پرۆسەکە بریتیە لە بەرامبەر یەکبوون و هەماهەنگ بوونی خوێن و ئەو ماددانەی لەناو ڕیخۆڵەدان لەسەر ئاستی خودی دیواری ڕیخۆڵە.

ئەم بیرۆکە وردو پوختە بەرهەمی دۆزینەوەکانی کیمیا و کارئەندامزانی یە لەبواری کۆئەندامی هەرسدا، ئەم ڕاستییانەش زیاتر لە هەزار ساڵ دوای موحەمەد (درودی خوای لەسەر بێ) دۆزراونەتەوە.

---

٣٢ ﴿بەڕاستی لە بوونی ماڵات و (زیندەوەرانی جۆراو جۆردا) پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆتان و جێگەی سەرنج و تێڕامانە، لەنێوان ئەوشتانەی کە لە سکیان دا هەیە، لە گژوگیای هەرسکراوو خوێن دا، شیرێکی پاک و بێگەردو خۆش و بەتام و گەوارا بەرهەم دەهێنین بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە﴾.

## کۆرپەلەزانی

لە قورئانی پیرۆزدا چەندین دەق لەسەر وەچەخستنەوەی مرۆڤ هاتوون و بەرەنگاری ئەو زانایانە دەکەن کە پشت بە لێکۆڵینەوەکانی مرۆڤ دەبەستن. لەڕاستیدا لەم دواییانەدا مرۆڤ پەی بەم دەقانە برد، ئەمەش دوای ئەوەی کە زانستی نوێ دەرکەوت و زانیاری مرۆڤ لەبارەی زیندەوەرزانی زیادی کرد و ئامێری وردبین (مایکرۆسکۆپ) داهێنرا، ئەمانە وایان لە مرۆڤ کرد بتوانێ لە قوڵایی ئەم دەقە قورئانیانە تێبگات و ڕاڤەیان بکات. لە سەرەتاکانی سەدەی حەوتەمدا مەحاڵ بوو مرۆڤ بتوانێ بیرۆکەی لەم جۆرە بە وردی و بە تەواوی دەرببڕێت. هیچ بەڵگەیەک نیە ئەوە پیشان بدات کە لەو کاتانەدا دانیشتوانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نیشتیمانی عەرەبی هیچیان لە خەڵکی ڕۆژئاوا و هەر شوێنێکی تر زیاتر زانیبێت. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زۆرێک لە موسوڵمانان زانیاری تەواویان هەم لەبارەی دەقە قورئانیەکان و هەمیش لە بارەی زانستە سروشتیەکانەوە هەیە، ئەمەش وایکردوە کە بتوانن وێکچوونە سەرسورهێنەرەکەی نێوان قورئان و زانستی هاوچەرخ لەبارەی وەچە خستنەوە بدۆزنەوە.

هـەرگیز کـۆمێنتی ئـەو گەنجـە موسـوڵمانە هـەژدە سـاڵیەم بـیر ناچـێتەوە کـە لـە سـعودیە گـەورە بوبـوو، ئەمـەش کـاتێ کـە کۆمێنتێکی لەسەر بابـەتێك نوسیبوو لـەبارەی وەچـە خستنەوەی مرۆڤ هەروەك لە قورئاندا باسکراوە. ئەو گەنجە ئامـاژە بـۆ قورئـان دەکاو دەڵێ " ئەم کتێبە زانیاریە بنـچینەییەکان لـەم بارەیـەوە بـە تەواوی پێشکەش دەکات. کاتێ لـە قوتابخانـە بـووم، مامۆسـتاکەم ئەم قورئانە پیرۆزەی بەکاردەهێنا تاوەکو چۆنیەتی دروسـت بـوون و لەدایك بوونی منداڵمان بۆ شـی بکاتـەوە، بـەڵام کتێبـەکانی ئێـوە لەبارەی پەروەردەی سێکسی یەوە تاوێك لە دواوەن!".

ئەگـەر هاتبـاو بـە وردی باسـی (وەچەخـستنەوە لـە قورئـانی پـیرۆز)م بکردایـە هــەروەك بابەتەکـەش دەخوازێـت، ئـەوا ئـەم نامیلکەیـە دەبـووە کتێبێکـی گـەورە. ئـەو ڕاڤـەو شـیکردنەوە زمانەوانی و زانستیانەی لـەم بارەیـەوە لـە کتـێبی (کتـێبی پـیرۆز و قورئان و زانست) باسم کردووە بۆ هەر کەسێ بەسە، تـا قـوڵتر لـەم ئایەتـە قورئانیانـە لـە ژێـر ڕۆشـنایی زانـستی هاوچـەرخ تێبگـات، تەنانـەت ئەگـەر عەرەبیـەکی تـەواویش نـەزانێ یـان زانیاریـەکی ئەوتۆشی نەبێ لەبارەی کۆرپەلەزانیەوە.

ئەگەر لە بواری کۆرپەلەزانیدا بەراوردێك بکەین لە نێوان زانیاریەکانی مرۆڤ لە ساتی دابەزینی قورئانی پیرۆز و زانیاریە زانستیەکانی ئەمڕۆ، ئەوا دەبینین کە ئەندازەی پێکەوەسازان و هەماهەنگیی قورئان و زانستی نوێ لە ئاستێکی سەرسوڕهێنەر دایە، ئەمە لە کاتێکدا کە نامەوێ زۆر ئاماژە بەوە بکەم کە هیچ دەقێکی قورئانی نیە بۆ ئەو بیرۆکە چەوتانە بگەڕێتەوە کە ئەوکات لە جیهاندا باو بوون.

# پیتێن

با بێین لەم ئایەتە پیرۆزانەدا بیرۆکەی لۆژیکی لە بارەی ئاڵۆزیی سپێرمەوە[٣٣] پوخت بکەین، هەروەها لەبارەی ئەو ڕاستییەی کە بڕێکی ئێجگار کەم لەم تنۆکە وردانە پێویستن بۆ دڵنیابوون لە ڕوودانی کرداری پیتێن. هەروەك خوای گەورە لە سورەتی (الآنسان) لە ئایەتی دووەمدا دەفەرموێ:

﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ ( الإنسان ٢ )[٣٤]

وشەی (نطفة) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای (بڕێکی زۆر کەم) دێت، ئەگەر بە فرمان بەکارهات ئەو کات بە واتای (دڵۆپ دڵۆپ هاتنە خوارەوە) دێت. ئەمەش بەو دڵۆپانە چوێنراوە کە لە ژێرەوەی مەنجەڵێك دەمێنێتەوە دوای بەتاڵکردنی. ئەم ئایەتە پیرۆزە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ئەوە دەگەیەنێ کە کرداری پیتێن بە تەنها لە لایەن قەبارەیەکی کەمی شلە ئەنجام دەدرێت.

٣٣ تۆوی پیاو (وەرگێڕ)

٣٤ ﴿بێگومان ئێمە ئینسانمان دروست کرد لە تێکەڵەیەك (لە سەرە مێکوتەیەکی بچوك و هێلکۆکەیەك) لە کاتێکدا دەمانەوێت تاقی بکەینەوە، هەر بۆیە دەزگای بیستن و بینینمان پێ بەخشی﴾.

لە لایەکی ترەوە، تێکەڵە شلە (أمشاج) ڕاڤەوانانی پێشتر بە تێکەڵەی تۆوی نێرینەو مێینە لێکیان دابووەوە، بەلاّم زانا هاوچەرخەکان ئەم بیرۆکەیەیان ڕاستکردەوەو تێبینی ئەوەشیان کرد کە سپێرم لە چەندین پێکهاتەی جیاجیا دروست بووە.

کاتێ قورئان باسی شلەی پیتێنەر دەکات کە پێکهاتەکەی جیاجیا و هەمەچەشنە، ئەوەشمان پێ ڕادەگەیەنێ کە وەچەی مرۆڤ لە شتێکی پوختەکراوی ناو ئەم شلەیە دروست دەبێت. هەروەك خوای گەورە لە سورەتی (السجدة) لە ئایەتی هەشتدا دەفەرموێ :

﴿ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ﴾ (سجدة-٨)[٣٤]

وشەی"سُلالة"بە مانای (کرۆك) دێت واتە (باشترین بەشی شتێك). کەواتە ئەگەر بە هەر مانایەك لێکی بدەینەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە مرۆڤ لە بەشێکی شتێك دروست بووە. ئەوەتا زانستی ئەمڕۆش ئەمە پشتڕاست دەکاتەوەو دەڵێ " لەماوەی کاری سێکسیدا زیاتر لە ٥٠ ملیۆن خانە لە پیاوەوە دەردەپەڕێت

٣٥ ﴿پاشان زنجیرەی نەوەکانی لە ئاوێکی سادەو بێ نرخ بەدیهێناوە﴾.

بەلآم تەنها یەك خانەی دەچێتە نێو هێلكۆكە ئافرەت و كرداری پیتێن ئەنجام دەدات، ئەو خانەیەش پێی دەگوترێ سپێرماتۆزۆن (Spermatozoon)".

## چاندن ( جێگیر بوون )

کاتێك هێلکە لە جۆگەی (فالوپ) پیتێندرا، بەرەو ناو منداڵدان (ڕەحم) بەڕێدەکەوێ، پاشان لە دیواری منداڵدان دا لە شوێنی خۆی دەگیرسێتەوە. ئەم پرۆسەیە پێی دەگوترێ " Implantation of the egg" واتە (چاندنی هێلکە)، چاندنی هێلکەش لە ئەنجامی گەشەسەندنی ڤیلۆسیتیەکانەوەیە (Villosities) کە ڕاستەوخۆ هێلکەکە بە دیواری ڕەحمەوە دەلکێنن. جا هەروەك چۆن ڕووەك خواردنی پێویست لە زەوی بەدەست دێنێ، ئەم ڤیلۆسیتیانەش بە هەمان شێوە خواردنی دابینکراو لە دیواری ڕەحمەوە بۆ هێلکەکە ڕادەکێشن و، وا لە هێلکەکە دەکەن کە بە منداڵدان (ڕەحم) ەوە بنوسێت و هەڵبواسرێت. ئەم پرۆسەیەی چاندنی هێلکە بە دیواری منداڵدانەوەو جێگیربوونی تیایدا لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باسی کراوەو بە "عَلَق" ناوی بردراوە. ئەم وشەیە ناوی یەکێ لە سورەتەکانی قورئانی پیرۆزیشە کە خوای گەورە لە ئایەتی دووەمدا دەفەرموێ:

﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ (علق ٢)[٣٦]

---

٣٦ ﴿ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵدان دا) دروستکردووە﴾.

پێم وانیە کە هیچ وەرگێڕانێکی گونجاو هەبێ بۆ وشەی "عَلَق" جگە لەوەی کە هەمان مانای بنەڕەتی خۆی بۆ دابندرێت. ئەوە هەڵەیە ئەگەر بێت و لێرەدا باسی خوێنی مەییو بکەین هەروەك مامۆستا حمید الله لە وەرگێڕانەکەیدا باسی دەکات. ئەوە مانایەکی داتاشراوە کە بۆ ئەو وشەیە گونجاو نیە کە لە دەقەکەدا هاتووە.

# کۆرپەلە

گەشەکردنی کۆرپەلە لەناو ڕەحمی دایکدا بە کورتی باسی لێوەکراوە، بەڵام ئەم باسە کورتە زۆر وردەو تەواو بابەتەکەی پێکاوە، چونکە ئەو وشە سادانەی قورئان کە باسی گەشەی کۆرپەلە دەکەن لەڕووی زانستیەوە تەواو لەگەڵ قۆناغە بنچینەییەکانی گەشەی کۆرپەلە دێنەوە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (المؤمنون) لە ئایەتی (١٤) دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون-١٤)[٣٧]

٣٧ ﴿لەوەودوا نوتفەکەمان کردووە بە خۆهەڵواسەرێك (سەرە مێکوتەیەك) پاشان خۆهەڵواسەرەکەمان کردووە بە گۆشتپارەیەك، ئینجا (شێوازی) گۆشتپارەیەکەمان بە پەیکەری ئێسك گۆڕیوەو بەگۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشیوە، ئەوسا لە شێوەیەکی تر دا دەرمانهێناوە (کە شێوەی ئادەمیزادێکی ڕێك و پێکەو ڕۆحی پێ بەخشراوە)، بەڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆزو موبارەکەو چاکترین بەدیهێنەرو چاکترین دروستکارە﴾.

لە یەکێك لە قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەدا، زاراوەی گۆشتپارە (مضغة) باشترین وشەیە کە بۆ شێوەی کۆرپەلەکە بەکاربێت.

ڕاستیەکی زانراوە کە ئێسکەکان لەناو گۆشتپارە گەشە دەکەن، ئینجا بە ماسولکەکان دادەپۆشرێن. جا لە ئایەتەکەدا (گۆشتی ساغ) هاتووە کە ڕێك بە مانای ماسولکە دێت.

کۆرپەلە لە یەکێك لە قۆناغەکاندا هەندێ لە بەشەکانی ڕێکن و ئەندازەیین و هەندێ بەشی تریشی ناڕێك و نا ئەندازەیین. ئەمەش تەواو هاومانایە لەگەڵ ئایەتی خوای گەورە کە زۆر بە ئاشکرایی لە سورەتی (الحج) لە ئایەتی (٥) دا دەفەرموێ:

﴿... فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ...﴾ (الحج-٥)[٣٨]

---

٣٨ ﴿... ئەوە چاك بزانن کە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروستکردووە، لەوەودوا (نەوەکان) لە نوتفەیەك (پەیدا بوون)، پاشان نوتفەش دەبێتە خۆهەڵواسەرێك لەناو منداڵدان دا، لەوەودوا دەبێتە گۆشتپارەیەکی تەواو سەروسیمادار، یان ناتەواو، (هەموو ئەم شتانە دەهێنینەوە یادتان) تا بۆتان ڕوون بکەینەوە کە ئێمە ئاوا ئێوەمان دروست کردووەو دووبارە دروستکردنەوەشتان لامان ئاسانە، ئەوەش بمانەوێ لە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکەین تا کاتێکی دیاریکراو﴾.

وێــڕای ئەمانــەش خــوای گــەورە باســی ڕوخــساری مــرۆڤ و هەســتەوەرەکانی و ئەندامــەکانی نــاوەوەی دەکــات، هــەروەك لــە سورەتی (السجدة) لە ئایەتی (٩) دەفەرموێ:

﴿... وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ...﴾ (السجدة-٩)[٣٩]

لێرەدا هیچ شتێك نیە لە قورئاندا کە دژایەتی زانست و زانیـاری ئەمڕۆ بکات، سـەرەڕای ئەمـەش هـیچ یـەکێك لـە هەڵـە و ئەفـسانە باوەکانی کاتی خۆی (سـەردەمی دابـەزینی قورئـان) نەخزیوەنەتـە نێـو قورئـانی پـیرۆز، هەرچـەندە کـە لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا کۆمەڵێك بیرۆکەو بڕوای جیاجیا هەبوو لـەبارەی گەشـەی مـرۆڤ کـە سەرچـاوەکانیان بـۆ ئەفـسانەو گریمانـەکان دەگەڕایـەوەو ئـەم بیرۆکانەش بۆ چـەندین سـەدەی دواتـر بـەردەوام بـوون. بنـچینەیی ترین قۆناغی کۆرپەلـەزانی لـە سـاڵی ١٦٥١ ی زایینـی بـوو، کاتێـك (ولیەم هارڤی) وتی "ژیان بە گشتی سـەرەتاکەی لـە هێلکەیەکـەوە دێـت". لـەو سـەردەمەدا زانـین سـودێکی زۆری لـە (دۆزینـەوەی وردبین) وەرگرت، بەلام هێشتا خەڵك مشت و مڕیان بوو لەسەر ڕۆڵە

---

٣٩ ﴿... ئینجا دەزگای بیستن و بینین و لێکدانەوەی پێ بەخشیون﴾.

یەك لەدوای یەكەكانی هێلكەو تۆوەخانە (سپێرماتۆزۆن).
سروشتزانی گەورە (بەفۆن) یەكێك بوو لەوانەی پاڵپشتی بیردۆزی هێلكەی دەكرد. لە لایەكی ترەوە (بۆنێت) پاڵپشتی بیرۆكەی (هێلكەدانەكانی حەوا) ی دەكرد كە پێی وابوو حەوا (دایكی مرۆڤایەتی) تۆوی هەموو مرۆڤەكانی تیابووە، هەریەكەیان لەناو ئەوەی تریان پێچراوەتەوە.

## كتێبی پیرۆز و قورئان و زانست

ئێستا ئێمە گەیشتینە دوا بابەت، لێرەدا دەمەوێ بەراوردێك بكەم لە نێوان زانستی نوێ و هەندێ دەقی پیرۆزی قورئانی كە لە كتێبی (كتێبی پیرۆز و قورئان و زانستی هاوچەرخ) یشدا ئاماژەم پێیان كردوون:

## وەدیهێنان

تا ئێستا چەندین دژیەكمان بینیوە لە نێوان زانست و دەقە ئاینیەكاندا لە بارەی وەدیهێنانی گەردونەوە. بەڵام كاتێك هاتمە سەر قورئان، هەماهەنگی تەواوم لە نێوان ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز و زانستی هاوچەرخ بەدی كرد. هەروەها پەیم بەوە برد كە كتێبی پیرۆز هەندێ دەقی وای تێدا هەن كە لە ڕووی زانستیەوە جێگای قەبوولكردن نین. توشی سەرسوڕمان دەبین كاتێك بۆمان دەردەكەوێت كە گێڕانەوەكانی نێو كتێبی پیرۆز لە بارەی وەدیهێنانی گەردوونەوە لەلایەن قەشەكانی سەدەی شەشەمی زایینی نوسراوەتەوە! هەر بۆیەش زاراوەی ( sacerdotal narration گێڕانەوەی قەشەیی) بە شێوەیەكی ڕەسمی بۆ ئەم مەبەستە بەكارهاتووە، گێڕانەوەكە زیاتر لە مەبەستی وتارێك

دەچێ کە بۆ هاندانی مەسیحیەکان ڕێکخرابێ تا هانیان بدات بۆ گرنگیدان بە ڕۆژی یەکشەمە (ڕۆژی پیرۆزی هەفتە). گێڕانەوەکە بە شێوەیەك بوو کە جێگای مشتومڕی تێدا نەبوو، هەروەکو (باوك دیڤۆکس) کە سەرۆکی پێشوتری قوتابخانەی ئینجیلیی ئۆرشەلیم بوو ئاماژەی بەوەداوە کە ئەم گێڕانەوە حەتمیانە سیفەتی شەرعیان پێدرابوو.

کتێبی پیرۆز گێڕانەوەی کورتتر و کۆنتر لە بارەی وەدیهێنان دەگرێتەخۆ، ئەو چاپەی کە پێی دەڵێن (یەهوا Yahvist[٤٠]) لە گۆشەیەکی تەواو جیاوازەوە بۆ بابەتەکە دەچێت. ئەمانە هەردوکیان لە (گێنەسیس Genesis[٤١]) وەرگیراون کە یەکەم کتێبی (پێنتاتیوك Pentateuch[٤٢]) یان تەوراتە کە گوایە موسا

---

٤٠ (یەهوا) یەکێکە لە چوار سەرچاوە سەرەکیەکانی تەورات و کۆنترینیانە. نیوەی (سفر التكوين) پێکدەهێنێت و نیوەی یەکەمی (سفرالخروج) و چەند بەشێکی (سفر العدد) پێکدەهێنێت. لەم سەرچاوەیەدا خودا بە شێوەیەك وەسف کراوە وەك ئەوەی کە لە مرۆڤ بچێت و پێی دەڵێن (یەهوا). (وەرگێڕ– ویکیپیدیا)

٤١ (گێنەسیس) بریتیە لە یەکەم کتێبی پەیمانی کۆن (تەورات) کە باس لە وەدیهێنانی گەردوون دەکات (وەرگێڕ – فەرهەنگی ویبستێر)

٤٢ (پینتاتیوك) بریتیە لە پێنج کتێبی یەکەمی دەقەکانی کتێبی پیرۆز (وەرگێڕ – فەرهەنگی ویبستێر)

نوسەری ئەم کتێبەیە، بەلاّم ئەو دەقەی (گێنەسیس) کە ئەمڕۆ لەبەر دەستماندایە چەندین گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

ئەو گێڕانەوەی (گێنەسیس) کە قەشەکان پێی هەڵساون باس لە زنجیرەی بنەماڵەکان دەکات و تا ئادەم درێژدەبێتەوە، بەلاّم بەوە ناسراوە کە بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی باس لەو زنجیرانە دەکات بۆیە کەس بە هەند وەریناگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە نوسەرانی ئینجیل لەوانە (مەتا و لۆقا) کەم یان زۆر وشە بە وشە دووبارە هەمان شتیان لە بارەی زنجیرەی بنەماڵەیی پێغەمبەر عیسا دارشتۆتەوە. (ماتیۆ) درەختی بنەماڵەیی پێغەمبەر عیسا تا پێغەمبەر ئیبراهیم باس دەکات، (لۆقا) ش تا پێغەمبەر ئادەم دەڕوات، ئەم دەقانەش لە ڕووی زانستیەوە پەسند نین چونکە بەروارێك دیاری دەکەن بۆ تەمەنی زەوی و، بۆ کاتی دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی، ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئەوەیە کە زانستی هاوچەرخ لەسەری دامەزراوە، لە کاتێکدا کە قورئانی پیرۆز هیچ بەراوردێك دانانێت.

پێشتر ئاماژەمان بەوەکرد کە تا چ ئاستێکی بەرز قورئانی پیرۆز لەگەڵ زانستی هاوچەرخ لەبارەی دروست بوونی گەردوونەوە هاوڕایە، لە کاتێکدا کە گێڕانەوەکانی کتێبی پیرۆز گونجاو و

هاوڕانین لەگەڵ زانستدا بەتایبەت کاتێك باس لە دروست بوونی گەردوون دەکەن بە دەرکەوتنی ئاو، هەروەها لە بارەی دروست بوونی ڕۆناکی کە دەڵێ لە ڕۆژی یەکەم دروست بووە، واتە پێش ئەستێرەکان لەکاتێکدا کە ئەستێرەکان سەرچاوەی ڕوناکین، هەروەها دروستبونی ئێوارە و بەیانی پێش دروست بوونی زەوی، وە دروست بوونی زەوی لە ڕۆژی سێیەم پێش دروست بوونی خۆر لە ڕۆژی چوارەم، دەرکەوتنی ئاژەڵ لە ڕۆژی شەشەم پێش دەرکەوتنی باڵندەکان لە ئاسماندا لە ڕۆژی پێنجەم، ئەگەرچی ئاژەڵەکان یەکەم جار دەرکەوتن. ئەم ڕستانە ئەنجامی ئەو بیرو ڕایانەن کە لە کاتی نوسینی ئەو دەقانەدا باو بوون، ئەگینا هیچ مانایەکی تریان نیە.

## تەمەنی زەوی

وەچەزانی لە کتێبی پیرۆزدا، کە دواتر بووە بنچینەی ڕۆژژمێری جولەکە، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە تەمەنی زەوی بریتیە لە (٥٧٣٨) ساڵ. ئەمەش شتێکە لە مەیدانی زانستدا بە دەگمەن دانی پێدا دەنێرێت. تەمەنی کۆمەڵەی خۆرمان بەنزیکەیی چوار بلیۆن و چارەگە بلیۆنێك ساڵ دەبێت و، دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ دەزانین بە نزیکەی دەیان هەزار ساڵ تەخمین کراوە، ئەگەر زیاتریش نەبێت. بێگومان قورئان هیچ ئاماژەیەك بە تەمەنی زەوی نادات و، ئەو زانیاریە ئایینیانەش کە تەمەنێك بۆ زەوی دادەنێن تایبەتن بە دەقە تەوراتیەکان.

## لافاوەکە[٤٣]

دووەم بابەتی گرنگ بۆ بەراورد کردن لە نێوان کتێبی پیرۆز و قورئان بریتیە لە "لافاوەکە". لەڕاستیدا گێڕانەوەکەی کتێبی پیرۆز تێکەڵەیەك لە دوو وەسفی لێك جیاواز لە خۆ دەگرێت، بە جۆرێك کە تەنانەت ڕوداوەکانیش لە هەریەکەیان بە شێوەیەکی جیاواز تێکگرێدراون. کتێبی پیرۆز باسی لافاوێکی گەردوونی دەکات و مێژووەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ ٣٠٠ ساڵ بەر لە ئیبراهیم (درودی خوای لەسەربێت).

بە پێی ئەو زانیاریانەی کە لە بارەی ئیبراهیمەوە (درودی خوای لەسەربێت) لەبەردەستمان دان، ئەو کارەساتە دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری سەدەی (٢١) و (٢٢) ی پێش زایین، ئەمەش بە پێی ئەو زانیاری و داتا مێژووییانەی کە ئەمڕۆ لەبەر دەست دان بە ڕاست دانانرێت. بۆ نمونە: چۆن دەکرێ بڕوا بەوە بکەین کە لە سەدەی ٢١ یان ٢٢ ی پێش زایین کارەساتێکی گەردوونی هەموو شارستانیەتێکی سەر ڕووی زەوی ڕامالیبێ، لە کاتێکدا هەمومان دەزانین کە ئەو ماوەیە دەکەوێتە چاخی پێش شانشینی

---

٤٣ مەبەست لێی لافاوەکەی سەردەمی پێغەمبەر نوحە (دروودی خوای لێبێ) (وەرگێڕ).

ناوەڕاست لە میسرڕ کە دەکەوێتە نێوان فەرمانڕەوایی بنەماڵەی دەو یازدە، جا لە ڕووی مێژووییەوە پەسندکراو نیە هەموو مرۆڤایەتی لەو سەردەمەدا لەناوچوبێت! کەواتە هەموو ئەو دەقانە بە پێی زانستی نویێ ڕەت دەکرێنەوە. لەم سۆنگەیەوە دەتوانین جیاوازیە بەرفراوانەکەی نێوان کتێبی پیرۆز و قورئان وەدی بکەین.

بە پێچەوانەی کتێبی پیرۆز، قورئان لە بابەتی لافاوەکە ئاماژە بەوە دەکات کە لافاوەکە تەنها بۆ سەر نەتەوەی نوح (درودی خوای لەسەربێ) بووە و، ئەمەش وەکو سزادانێك بووە بۆ ئەو گوناهانەی کە لەسەری بەردەوام بوون. قورئان کاتی ڕوودانی ئەم کارەساتە دیاری ناکات. بێگومان هیچ ڕەخنەو ڕەتکردنەوەیەکیش نیە لە لایەن مێژوونوسان و شوێنەوارناسانەوە بەرامبەر بە گێڕانەوەکەی قورئانی پیرۆز.

# فیرعەون

سێیەم بابەت بۆ بەراوردکردنی کتێبی پیرۆز و قورئـان، کـە زۆر گرنگـە بریتیـە لـە "چـیرۆکی موسـا پێغەمبـەر" (دروودی خـوای لێبێت)، بە تایبەتی دەرچوونی عیبریەکان لـە میـسر. لێـرەدا تـەنها باسـی پوختەیـەکی ئـەو لێکۆڵینـەوەی خۆمتـان بـۆ دەکـەم کـە لـە کتێبەکەم[٤٤] دا باسمکردووە. لەبارەی ئەم چیرۆکەوە تێبینی ئەوەم کردووە کە کتێبی پـیرۆز و قورئـان لـە سـەر هەنـدێ خـاڵ کـۆکن و لەسەر هەندێکی تر پێچەوانەی یـەکترن، لـە هەمانکاتـدا لـە هەنـدێ خاڵدا بە شێوەیەکی ئاسایی یەکتری تەواو دەکەن.

لــە نێــو ئــەو گریمانانــەی کــە ئامــاژە بــە کــاتی دەرچــونی موسا(درودی خوای لەسەربێ) دەکـەن لـە مێـژووی فیرعەونەکانـدا، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ڕاستترین تیۆر ئەوەیە کە جێگـرەوەی ڕەمسیسی دووەم کە ناوی (مێرنـەبتاح) بـوو، ئـەو فیرعەونەیـە کـە کاتی خۆی عیبریەکانی لە میـسر وەدەرنـاوە. بـەراوردکردنی دەقـە ئاینیەکان و بەڵگەنامە شوێنەوارییەکان پـشتگیریەکی بـەهێزی ئـەم تیۆرە دەکەن. شـادومانم بـەوەی کـە دەتـوانم بڵـێم: گێڕانەوەکـەی

---

٤٤مەبەست پێی کتێبە بەناوبانگەکەیەتی (کتێبی پیرۆز و قورئان و زانستی نوێ)، (وەرگێڕ).

کتێبی پیرۆز بەڵگەیەکی گرنگمان پێدەدات لە بارەی بوونی موسا لە مێژووی فیرعەونەکان دا. زیاتر پێدەچێ موسا لە ماوەی فەرمانڕەوایی ڕەمسیسی دووەمدا لەدایك بوبێت، کەواتە لێرەدا زانیاریەکانی کتێبی پیرۆز خاوەنی بەهایەکی مێژویین لەبارەی چیرۆکی موسا(سەلامی خوای لێ بێ). توێژینەوە پزیشکیەکان لەسەر مۆمیای مێرنیبتاح زانیاری زۆر بەسودتری بۆ ئاشکرا کردین لەبارەی هۆکارەکانی مردنی فیرعەون. لە ڕاستیدا یەکێك لە گرنگترین بەڵگەکان بریتیە لە بوونی مۆمیای فیرعەون. کتێبی پیرۆز ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ کە فیرعەون نوقمی دەریا بووە، بەڵام هیچ زانیاریەکی زیاترمان پێ نالێت کە ئایا دواتر چی بەسەر لاشەکەی هات!. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەوە دەکا کە لاشەی فیرعەون لە ناو دەریازدەکرێت و دەپارێزرێت هەروەك لە سورەتی (یونس)دا دەفەرموێ:

﴿فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾ (یونس-٩٢)[٤٥]

---

٤٥ ﴿ئەمڕۆ ئیتر لاشەی تۆ ڕزگار دەکەین تا ببێتە موعجیزەو پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای تۆ دێن (دیارە خوای گەورە پاراستویەتی لەوەی کە ماسی بیخوات، شەپۆلی دەریا گەیاندیە کەنار، تا ئەوانەی کە بەخوایان دەزانی بەچاوی خۆیان ببینن کە فیرعەون ئادەمیزادێکە وەك ئەو خەڵکەو ببێتە پەند، بۆ هەموو پاشاو زۆردارەکانی سەر زەوی کە ئەوە سەرەنجامی مسۆگەری هەموویانە)، بەڵام بەڕاستی زۆربەی خەڵکی لە ئایەت و موعجیزەکانی ئێمە غافڵ و بێ ئاگان﴾.

بە پێی پشکنینێکی پزیشکی مۆمیاکەی فیرعەون، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ناگونجێ لاشەکەی بۆ ماوەیەکی زۆر لە ئاودا مابێتەوە، چونکە هیچ نیشانەیەکی تێکچونی ئەو لاشەیە دەرناکەوێ کەلە ئەنجامی مانەوەی زۆر لە ژێرئاودا پەیدابووبێ. جارێکی تر دەردەکەوێ کە بە بەراورد کردنی گێڕانەوەکەی قورئانو زانیاریە زانستیەکان، زانستی هاوچەرخ مەودای هیچ ڕەخنەیەکی بۆ نامێنێتەوە.

ئەو پێکەوە سازانەی کە لە نێوان زانستی هاوچەرخ و قورئاندا هەیە یەکێکە لە خاسیەتەکانی سروشتی قورئانی. بەلأم ئایا دەکرێ ئێمە تێکڕای سروشتی مەسیحیەت و جولەکە بە هەموو ئەو بەها جەوهەریانەی کە دەیانگرنەخۆ ڕەتبکەینەوە، بە هۆی جەخت کردنەوە لەسەر ئەو هەڵە زانستیانەی کە لێیان دەگیرێن؟. من پێم وانیە، چونکە ئەو ڕەخنانەی کە لە کتێبی پیرۆز دەگیرێن، سەراپای کتێبەکە ناگرنەوە، بەڵکو ئەم ڕەخنانە تەنها چەند شوێنێکی کتێبەکە دەگرنەوە. هەندێ دەقی نێو کتێبی پیرۆز بەهایەکی مێژویی گومانلێنەکراویان هەیە. لە کتێبەکەشم "کتێبی پیرۆز و

قورئان و زانست" لەو بەشەی کە باسم لە زانینی سەردەمی موسا (سەلامی خوای لەسەربێ) کردووە، ئاماژەم بەو دەقانە داوە.

زانا هاوچەرخەکان ئاگادارن بە هۆکارە سەرەکیەکانی بوونی دژیەك و جیاوازی لە نێوان کتێبی پیرۆز و زانستی هاوچەرخدا!. پەیمانی کۆن[٤٦] لە کۆمەڵێك دەقی ئەدەبی پێکهاتووە کە لە ماوەی نزیکەی نۆ سەدەدا نوسراونەتەوەو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە چەندین جاریش هەموار کراون. کەواتە ڕۆڵی مرۆڤ لە داڕشتنی ڕاستەقینەی ئەو دەقانەی نێو کتێبی پیرۆز بە ڕوونی هەستی پێ دەکرێ.

لە لایەکی ترەوە، سروشی قورئان خاوەنی مێژوویەکە کە لە بنەڕەتەوە جیاوازە. وەك ڕوون و ئاشکرایە، قورئان لەو ساتەی کە بۆ مرۆڤایەتی دابەزی، هەر لە ماوەی ژیانی موحەممەد دا (درودی خوای لەسەربێ) خەڵکێکی زۆر لەبەریان کرد و فێری بوون و، هەر لەو ماوەیەشدا نوسرایەوە. ئەمەیە بەڕاستی هۆکاری ئەوەی کە بە

---

٤٦العهد القديم Old Testment (وەرگێڕ)

هیچ شێوەیەك كێشە و گومانمان لە ڕاستەقینەیی قورئانی پیرۆز نییە.

ئەگەر لەژێر ڕۆشنایی زانستی هاوچەرخ و بەشێوەیەكی بابەتیانە لە قورئانی پیرۆز وورد ببینەوە، ئەوا دان بەو ڕاستیەدا دەنێین كە پێكەوە سازانێكی تەواو لە نێوان زانستی نوێ و قورئاندا هەیە، هەروەك چەند جارێكی تریش ئەوەمان باس كردووەو ئاماژەمان پێداوە.

لێكۆڵینەوە لە قورئان وامان لێدەكات كە بە هیچ جۆرێك ئەو گومانەمان بە خەیاڵدا نەیەت كە كەسێك لە سەردەمی محمد (درودی خوای لەسەربێ) نوسەری كتێبێكی وابێ، ئەمەش بە لەبەرچاوگرتنی ئەو زانستەی كە لەو سەردەمەدا هەبووە. جا ئەو خاڵانەی كە ئاماژەمان پێدان وا دەكەن كە قورئانی پیرۆز كتێبێكی شاز و دەگمەن بێ لە نێو تێكڕای كتێبە ئایینی و نائاینیەكانداو هەر زانایەكی بێ لایەن ناچار دەكەن كەدان بە بێتوانایی خۆی بنێ لە خستنەڕووی هەر شیكردنەوەیەك كە تەنها پشت ئەستور بێت بە هەڵسەنگاندنە مادیەكان.

ئـەو ڕاسـتیانەی کـە لێـرە بـە خۆشـحاڵیەوە پێـشکەشم کـردن تەحەددایەکی ڕاستەقینەیە بۆ توێژینـەوەکانی مـرۆڤ و، تـەنها یـەك هەڵبژاردەیان بۆ دەهێڵێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە بێ گومان قورئـان سروشی خوای گەورەیە.

# ناوەرۆك